وەهبی وەققاس ئۆغلوو

چواردەم چاپ

4

# یاداشتنامەی مامۆستایەک







و: د. زانا ئەحمەد



بسم الله الرحمن الرحيم

ناوی کتێب: یاداشتنامەی مامۆستایەك

بەرگی چوارەم

نووسەر: وەهبی وەققاس ئۆغلۆو

وەرگێڕ: د. زانا ئەحمەد

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە ( ١٦٣٧ )ی ساڵی ٢٠٠٩ ی پێدراوە



## پێشەکی

بەچکە ماسی لە دایکیی پرسی:

– دایە! باسی شتێك دەکەن بە ناوی ئاو، پـێم نالێیـت ئـەم ئاوە چییە؟ تو خودا پێمی پیشان دەدەیت؟

دایکیشی پێی وت:

– جا ڕۆڵە! ئەگەر تۆ توانیـت جگـە لـە ئاو شـتێکی تـرم پیشـان بدەیت، منیش ئاوت پیشان دەدەم.

ئـەم وەڵامـە زۆر پەنـدئامێزە. ناویـەناو هەنـدێك ڕۆشـنبیر (!) دەنووسن و دەڵێن: ناتوانین لە هەبوونی خودا بگەین، بۆیە باوەڕمـان پێی نییە. بەڵێ، ئەگەرچی بەم چاوە سنووردار و ناتەواوەی دونیامان

ناتوانین خودا ببینین، بەڵام بە دیتنی ئەو ملیۆنان ئافەریدەیەی بە دەستی ئەو هاتوونەتە بوون، دەتوانین لە هەبوونی دڵنیا ببین. ئەگەر نا چ مانایەك بۆ بوونی ئەو هەموو ئافەریدەیە دەمێنێتەوە؟ بۆیە ئێمەش دەتوانین بە هەمان لۆژیکی دایکە ماسی بڵێین: ئێوە شتێکمان پێ پیشان بدەن نەبوونی ئەو بسەلمێنێت، تا ئێمەش بوونیتان بۆ دەربخەین.

بوونی ئەو، هەموو شتێکی تەنیوە. هەر بوونەوەرێك بەڵگە و نیشانەیەکە لەسەر بوونی. لە هەموو لایەکی جیهاندا شتانێك هەن سیفەتەکانی ئەو دەردەخەن. لە هەموو شتێکی جواندا، جوانیی ئەو دەدرەوشێتەوە. لە ڕێی ئەو هۆگرییەی خستوویەتییە مێشکمانەوە، بەدوایدا دەگەڕێین. بەهۆی ئەو بیر و هۆشەی پێی داوین، لە بەڵگەکانی تێدەگەین. لە سایەی ئەو ئەوینە بێ سنوورەی خستوویەتییە دڵ و دەروونمانەوە، ئەومان لە هەموو شتێك خۆشتر دەوێت.

پشت بە خودا هێز و دەسەڵاتی ئەو لەملا و لەولا و پشتی خۆمان دەبینین و دەگەین بە ئاسوودەیی، لەوە دەگەین کە خودا لەگەڵ ڕاستییەکانە و وەك ئەوەش دەبین کە ئەو فەرمانی پێداوین.

***

ڕێی ڕاست ئەوەیە کە دەچێتەوە لای ئەو، هەرچی ئەو ڕێیەشە کە بەرەو لای شەیتان و گومڕایی دەڕوات، ئەوە ڕێی ڕاست نییە و، ڕەوکردن پێیدا بێ ئاگاییە لە ئامانجی بەدیهێنرانمان. دەبێت لەسەر ڕێبازی ئەو بڕۆین و بە خۆشەویستیی ئەوەوە بژین، بە چاوی خۆشەویستییەوە سەیری هەموو گیاندار و بێ گیانێک بکەین و لە بەرانبەر هەموو بەدیهێنراوێك لەبەر خاتری بەدیهێنەر لێبووردە و سینگ فراوان بین.

جا یەکێك بەو هەموو بەڵگانەوە ئەو نەبینێت و هەست بە تاك و تەنهایی و گەورەیی نەکات، هەق وایە چی پێ بوترێت؟ دەبێت ئامۆژگارییان بکەین واز لە چاوی سەر بێنن و بە چاوی ئەقڵ و زانست بڕوانن. چونکە خۆ وابەستە کردنیان تەنها بەو شتانەی بە چاوی سەر دەیانبینن و باوەڕ نەبوونیان بەو شتانەی ناکەونە بەر چاویان ساویلکەییان دەسەلمێنێت. لەم دەور و زەمانە دواکەوتوویی ئەو کەسەی دەڵێت: "ئەوەی نەیبینم دانی پێدانانێم"، شتێکە مشتومڕ هەڵناگرێت...

کەواتە دەبێت بزانین چۆن دەڕوانین. دەبێت ئاستێك بۆ بینین دابنێین و چاوی زانست و دڵمان بکەینەوە. ئەوانەی هەوڵ دەدەن بە چاوە سنووردار و پڕ لە کەموکوڕییەکانیان هەموو شتێك ببینن، لەو کەسانەن کە بە دوعایەکی مەحاڵ دەڵێن ئامین. ئەوەی دەیەوێت

ببینیٚ ئینجا باوەڕ بێنێت، «ئەقڵی لە چاویدایە، چاویش لە جیهانی مەعنەوییاتدا نابینایە».

***

بەڵام تامەتایە بێباوەڕان هەر دەمێنن. ئەو بەگژیەکداچوونەی خێر و شەڕ -کە لە سەردەمی حەزرەتی ئادەم بەرپا بووە و تا ئێستاش بەردەوامە و شەڕی نێوان باوەڕدار و بێباوەڕان- هەر نەبڕاوەتەوە. هەر کەسە و دەیەوێت بیروباوەڕەکەی خۆی بلاو بکاتەوە، کەیفی دێتەوە ئەگەر بتوانیٚ کەسانی تریش بێنێتە سەر باوەڕەکەی خۆی.

ئەگەر ئەم یادداشتنامەیە و ئەوانەش کە بەدوایدا دێن، بتوانن هەنگاوێکی گچکە بن لەو ڕێیەدا، چ دڵخۆشییەکە بۆ ئێمەومانان؟ لەو باوەڕەداین کە لە سەلماندنی بوون و تەنهایی خودا کارێکی گەورەتر نییە.

وەهبی وەققاس ئۆغڵوو

نیسانی ١٩٨٧

باخچەلی ئێڤلەر



## بێباوەڕیی...

## بانگەشەیەکی بێ بنەما

هەنـدێك ڕووداو کـە بەسـەرمدا هـاتوون، زۆر بـەڕوونی بۆیـان دەرخستووم کـە بانگەشـەی بێبـاوەڕیی هـیچ بنەمایـەکی نییـە، بۆیـە قەت بـاوەڕ بـە کەسێك ناکـەم بڵێت بـاوەڕم بـە خـودا نییـە. گومـان لەوەدا نییە کە ئەوانـەی بانگەشـەی بێبـاوەڕیی (بێخـودایی) دەکـەن، ئەوانیش هەڵگری بیروباوەڕێکن، ئیتر یەکێك باوەڕی بە ماڵ و سامان و یەکێکی تر بە زانست و یـەکێکی تـریش بـە هۆکارەکـان هەیـە و بـە خولقێنەری دادەنێت. هەندێکیش هەن باوەڕیان بە خودا هەیە، بـەڵام هەسـت بـەو باوەڕدارییـەی خۆیـان ناکـەن، هـەر کاتێـك دووچـاری کێشـەیەك ببنـەوە باوەڕەکـەیان خـۆی دەردەخـات. هەنـدێك لـە

بێباوەڕانیش بەهۆی ڕووداوگەلێکی ناخۆش کە بەسەریاندا هاتووە لە خودا یاخی بوونە و کەوتوونەتە نکوولّی کردن لە بوونی، وەك چۆن هەندێك کەس نکوولّی لە باوکی خۆیان دەکەن و حاشایان لێدەکەن.

لەبەر ئەم هۆیانە وا هەست ناکەم ئەوانەی نکوولّی لە بوونی خودا دەکەن ڕاست بکەن. نکوولّی کردنەکەیان بە هۆکارگەلێکی سادە وەك بۆیەی ساختە نامێنێت و باوەڕەکەی ژێری خۆی وەدەردەخات.

## ئەو بێباوەڕانەی پەی بە باوەڕدارییان نابەن

هێشتا تەمەنم نەگەیشتبووە بیست ساڵان، بۆ کانییە بەناوبانگەکەی (هاروونیە) دەچووم. هەڵبەتە ئەو کات هەموو شوفێرێك نەیدەوێرا خۆی لەو ڕێیە پێچاوپێچەی نێو دارستانەکانی ئەو کۆسارە بدات. گەلابەیەکی بچووکمان بە کرێ گرت. چەند خێزانێك پێخەف و مێخەفمان لە ناوی ڕاخست و لێی دانیشتین. دوای ماوەیەك خۆمان لە ڕێگا و بانەکانی نێو سەوزاییە دلّڕفێنەکاندا بینییەوە. بە بیستنی ئاوازە نەگۆڕەکەی زیکزیکە و لەنێو دارسنۆبەرە بەخۆکاندا و لەناو تەپوتۆزی ئۆتۆمبێلەکەمان بە هەڵەتەکەدا هەڵدەکشاین. لە خودا بە زیاد بێ، هیچ سەیارەیەك بەرەو ڕوومان نەدەهات، وا نەبووایە حاڵمان زۆر خراپ دەبوو، چونکە لە

هەندێك شوێن ڕێگاكە ئەوەندە تەنگ بوو، دوو ئۆتۆمبێلی پێدا نەدەچوو.



لە هەندێك لە لۆفەكاندا بەرد لەژێر تایەكانەوە دەردەپەڕی و غلۆر دەبووەوە ناو دۆڵەكە. بە هەزار حاڵ هەورازە دوور و درێژەكەمان تێپەڕاند و گەیشتینە تەختایی. دوای كەمێكی تر نشێوی دەستی پێدەكرد. من بۆ ئەوەی لە بینینی ئەو دیمەنە دڵڕفێنانە نەبمەوە، حەزم نەدەكرد گەشتەكەمان بە كۆتا بێت، لە هەوا سافە فێنكەكە تێر نەدەبووم، بۆیە قووڵ قووڵ هەڵمدەمژی. لەناكاو شتێكی زۆر سەیرم دی، واقم وڕما. جارێكی تر تەماشام كرد، جارێكی تر، جارێكی تر، خۆم پێنەگیرا هاوارم لێهەڵسا:

– ئەی خودایە! سەیری ئەو سنۆبەرە بكەن، چۆن لەسەر ئەو بەردە ڕەق و تەقە ڕواوە، خۆ چنگێ خۆڵی لەسەر نییە؟

که من ئاوا بە دەنگەوە بیرم دەکردەوە، پیاوێکی بەساڵداچوو –کە لە بەرانبەرم دانیشتبوو– لەم جۆش و خرۆشەی من قەڵس بوو، وتی:

– جا چییە؟ هی وا لەم دەوروبەرە گەلێك زۆرە...

– چۆن چییە؟! سەیری توانای ئەو خودایە بکە، لەسەر گاشە بەردێك سنۆبەرێکی بەدیهێناوە...

– دە بەسە تۆش! ئەمە چ پەیوەندییەکی بە خودا و توانای ئەوەوە هەیە؟

– ئەی ئەگەر وا نییە، چۆنە؟ بە ڕای تۆ کێ ئەم دارەی لەم شوێنەدا ڕواندووە؟!

– کوڕم! هیچ کەسێك. بۆ ئیللا دەبێ یەکێك خولقاندبێتی؟ ئەم بیروباوەڕانە کۆنن و باوڕیان نەماوە.

– باشە ئەگەر خودا ئەمەی نەکردووە، کێ کردوویەتی؟

– دەتوانی وا بیربکەیتەوە کە باڵندەیەك تۆیەکی سنۆبەری بە دەنووك هەڵگرتووە و لێی کەوتووەتە سەر ئەم گاشە بەردە. ئینجا تۆیەکەش کەوتووەتە نێو درزێکی بەردەکەوە و لەنێو گڵی ناو ئەو درزە ڕەگی داکوتاوە و شین بووە، دواتر ڕەگەکە وردە وردە گەیشتووەتە بنی بەردەکەوە و دارەکە گەشەی کردووە.

– خۆ ئەگەر واش بێت ئەی نابێت یەکێك ئەم هەموو شتەی بەدیهێنابێ؟

– بێگومان نا... باوەڕ بوون بە شتێك بە ناوی خودا لەم سەردەمەدا نەنگییە.

– چۆن دەتوانی بەم سەرە چەرمووەتەوە وا بڵێیت؟! من دەتوانم چەندین نموونەت لەسەر ئەم مەسەلەیە بۆ بێنمەوە.

ئا بەم جۆرە دەمەتەقێکەمان بوو بە دەمەقرێ، لەبەر ئەوەی کابرا دەنگی تێنابوو و منیش کەوتمە دەنگ هەڵبڕین، دەنگمان بەرز بووەوە. هاوگەشتەکانمان بەکرپی گوێیان لێگرتبووین، ناوبەناو ئەوانیش خۆیان دەخستە ناو مەوزووعەوە. جگە لەم پیرەمێردە –کە پێدەچوو خوێندەواریش بێت– هیچ کامێکیان نکوولّییان لە بوونی خودا نەدەکرد، بەڵام خواخوایان بوو زوو بیبڕینەوە و بێدەنگ ببین.

لەم سەروبەندەدا ئۆتۆمبێلەکەمان وردە وردە کەوتە تیژڕەوی، ئەو بەردانەی لەبن تایەکانەوە دەردەپەڕین، نزیکەی سەد مەترێك دەردەپەڕین و دەکەوتنە ناو ڕووباری (جەیهان)ەوە. بە بینینی ئەمە هەموومان حەپەسابووین، کڕوکپ دانیشتبووین و لە یەکترمان دەڕوانی. ئا لەم کاتەدا بابای شوفێر سەری دەرهێنا و هاواری کرد: "برێکم نەما!". لای ڕاستمان کەمێك نشێو بوو و پڕ لە دارسنۆبەر بوو، لە خوارەوەی نشێوییەکەش ڕووباری جەیهان بوو، کە ئاوەکەی

لە گاشە بەردەکانی دەدا و قەڵبەزەی دەکرد. هەرچی لای چەپیش بوو، قەدپاڵێکی پڕ لە تاوێرە بەردی قیت بوو.

دوای چەند چرکەیەك حەپەسان، هەمووان کەوتنە هاوار و ناڵە. یەکێك شایەتمانی دەهێنا، یەکێك بیسمیللای دەکرد، یەکێکی تریش هاواری خودای دەکرد و لەبەر خۆیەوە دەپاڕایەوە. هەرچی ئەو پیرەمێردەشە کە دەیگوت خودا نییە، کۆنتڕۆڵی خۆی لە دەست دابوو و لەبەر خۆیەوە هەر دەیگوت: "خوایە گیان، خوایە گیان!". ئەم بارە زۆری نەخایاند، لەنێو سەرسوڕمان و حەپەسانەکاندا ئۆتۆمبێلەکە وردە وردە هێور بووەوە و لایدایە لایەکەوە. وەستا و نەوەستا، هەر کەسە و هاواری دەکرد و دەیوت:

– ئەمە چ کارێکە دەیکەی، کابرا؟!

– ئەی نەتوت برێکم نەما؟

– هەناومان پسا!

– ناکا گاڵتە بووبێت؟!

شوفێرەکە دابەزی و هاتە لای ئەو پیرە پیاوەی – کەمێك لەوەوپێش مشتومڕم بوو لەگەڵی – و پێی وت:

– ئەرێ تۆ شەرم ناکەیت دەڵێی خودا نییە؟! کەمێك لەمەوبەر دەتوت خودا نییە، بەڵام کە وات زانی برێك نەماوە، لە هەمووان زیاتر هاواری خودات کرد. ئەگەر خودا نییە، ئەی بۆ هاواری دەکەیت؟!

ئینجا ڕووی لە ئێمە کرد و وتی:

– بمبەخشن، برێک و مرێک هیچ عەیبێکی نەبوو. گوێم لە دەمەقاڵێکەتان بوو، ویستم دەرسێکی ئەو پیاوە دابدەم.

ئینجا چووەوە جێی خۆی و سوکانی گرتەوە دەست. کاتێک ئۆتۆمبێلەکە کەوتەوە جووڵە، بەس دەنگی زیکزیکە دەهات، کەس چپەی لێوە نەدەهات. کابرا پیرەکەش ڕەنگی سوور هەڵگەڕابوو و لە دەریای بیرکردنەوەدا ڕۆچووبوو، کە گەیشتینەجێ و لە داگرتنی کەلوپەلەکانمان بووینەوە، هاتە لام و وتی:

– ڕۆڵە گیان! داوای لێبووردنت لێدەکەم. ئەوەندە ساڵە خۆم وا دانابوو کە باوەڕم بە خودا نییە، بەڵام ئێستا بۆم دەرکەوت منیش باوەڕم پێی هەبووە، بەڵام لەوە بێئاگابوومە. تۆ بوویتە هۆی ئەوەی لەم ڕاستییە بگەم.

ئینجا ڕووی لە شوفێرەکە کرد و پێی وت:

– کاکەی شوفێر! زۆر سوپاست دەکەم، هەلێکی وات بۆ ڕەخساندم پەی بە باوەڕەکەم ببەم.

## کەسێك نییە دوعایەك بزانیٚ؟

مرۆڤ کە تووشی تەنگوچەڵەمە دێت خودای بیر دەکەوێتەوە. هەر کە دەکەوێتە شێنەییشەوە لە بیری دەچێتەوە. هەڵبەتە ئەمە شتێکی بەجیٚ نییە، ئەمە باوەڕداریی تەواو نییە. ئایەتی ٦٧ی سوورەی ئیسرا بەم جۆرە باسی ئەم بارە دەکات:

﴿وَ إِذَا مَسَّكُمُ الضُّرُّ فِي الْبَحْرِ ضَلَّ مَنْ تَدْعُونَ إِلاَّ إِيَّاهُ فَلَمَّا نَجَّاكُمْ إِلَى الْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ وَ كَانَ الإِنْسَانُ كَفُورًا﴾ الإسراء: ٦٧، واتە: " **کاتیٚ لە ناو دەریادا تووشی ناڕەحەتی دەبن، ئەوانەی هاواریان لیٚ ئەکەن هەموو ون ئەبن و لەیادتان ئەچن چونکە ئەزانن هیچیان لەبارەدا نییەو هیچیان پیٚ ناکریٚ خودا خۆی نەبیٚ. جا کە خودا ڕزگاری کردن و گەیاندنیە وشکانی، پشتی لیٚ هەڵئەکەن و موبالاتی پیٚ ناکەن و لێی ناپاڕێنەوەو ئەکەونەوە پاڕانەوە لە بتە هیچوپووچەکانتان. بەڕاستی ئینسان ناشوکرە بە نیعمەتی خوای گەورەو باوەڕی پێی نییە..** "

بەڕاستی هەر وایە، کاتێك مرۆڤ هیچی لەدەست نامێنیٚ و بیٚ ئومێد دەبیٚ، هاواری خودا دەکات. کاتێکیش ڕزگاری دەبێت و دەگاتە کەناری ئارامیی، خودا لەبیر دەکات و سوپاسگوزاریی و بەندایەتیی کردنی بە پێویست نازانێت، بێگومان ئەمە سپڵەییە. بەندە نموونەیەکی زیندوو و ڕوونی ئەمەم بینیوە:

له ڕۆژێکی پایزدا لـه ئیستەنبووڵەوە بۆ (یـەلۆڤا) دەچـووم. بـان پاپۆڕەکە سیخناخ بـوو لـه خـەڵکی. هەنـدێکیان خـەریکی خـواردن و خواردنەوە بوون. هەبوو گۆرانی دەچڕی. کەسانێکی تـر بـه هـەرا و هوریـا و سـوعبەتەوە خـەریك بـوون، هەنـدێکی تـر یارییـان دەکـرد و کەسـانێکیش هـەبوون خـەریکی خۆبـادان بـوون. کاتێـك کـەمێك لـه (بیووك ئەدە) دوور کەوتینەوە، هـەور هـات و شـنەبایەك هـەڵی کـرد. سەرەتا کەس گوێی پێنەدا. بەڵام دواتر بایەکە بـەهێز بـوو و بـوو بـه باهۆز. ئـەوەی خـەریکی جووڵـه جـووڵ بـوو دانیشـت، دەنگـه دەنـگ کەمەوە بوو. پاپۆڕەکەمان وەك توێکڵی کەستانە کەوتە ئەملا و ئەولا کردن. بەس دەنگی غلۆر بوونەوەی شووشەی مەی و کەوتنی کاڵاکان و گڕوکاڵی منداڵان دەهات... وای لێهات شەپۆڵەکان خۆیان گەیانـدە سـەر رووی پاپۆڕەکـە. هـەمووان لەبـەر خۆیانـەوە دەیـانوت: "کـەی (مەڕمـەڕە) لـەم وەرزەدا وا بـووە؟!". هاوار و ناڵەکان زیادیـان کـرد، هەر وەك چۆن شەپۆلەکان و هەژینی پاپۆڕەکەش زیادیان کرد.

لـەو کاتـەدا پیرەژنێـك هاتـه ناومانـەوە و هـاواری کـرد: "ئـەرێ خەریکە نغرۆ دەبین و لەناو دەچین، کەسێك نییە دوعایەك بزانێت؟".

کوڕە گەنجێك هەستایەوە، سەرەتا بانگێکی دا، ئینجا سێ جار سوورەی ئیخلاس و جارێك فاتیحەی خوێند و پێشکەشی ڕۆحی پێغەمبەرمان (دروودی خودای لێ بێت) و سەرجەم پێغەمبەرانی تری کرد. دوای ئەوە شایەتمانێکی بەکۆمەڵی پێهێناین و دواتریش هەندێك قسەی بۆ کردین. باسی ئەوەی کرد کە ئەمە ڕووداوێکی پەندئامێزە و بۆ ئەم وەرزە شتێکی سەیرە، هەبێ و نەبێ هۆشیار کردنەوەیەکی خوداییە، بۆیە دەبێت دەرس و عیبرەتی لێوەربگرین. لە گوێڕایەڵیی خەڵکەکە چاونەترسی گرتی و تەکلیفێکی کرد، وتی:

"ئەگەر بە هەوڵ و هیممەتی خودا، بە ساغ و سەلامەتی گەیشتینە بەندەری (یەلۆڤا)، هەمووتان بەر لە هەر شتێك لە مزگەوتی بەندەرەکە نوێژێك بکەن، دوای ئەوە بۆ کوێ دەچن بچن". هەموویان بە دڵ و بە گیان داواکەیان پەسەند کرد.

پاپۆڕەکە گەرچی نیو سەعاتێك دواکەوت، گەیاندینییە جێ. هێشتا دەریاکە دانەمرکابووەوە و شەپۆلەکان خۆیان لە بەندەرەکە نزیك دەکردەوە. کوڕە گەنجەکە بە خۆی و چەند کەسێکەوە ڕوویان کردە مزگەوتێکی ئەو نزیکە، سەدان کەسیش لە سەرنشینەکان، بۆ ئەوەی ساتێك زووتر بگەنە هاوینەهەوارەکان، بە هەڵەداوان خۆیان ئاخنییە تەکسییەکانی ئەو نزیکە...

# ڕووناکیی هیوا لەنێو دڵاندا

بەدرێژایی مێژوو جڤاکێکی بێباوەڕ بوونی نەبووە، بەڵام تاکی بێباوەڕ لە هەموو دەمێکدا بووە. دەمەتەقێیەکی نێوان هەندێك کەس کە باوەڕیان بەوە نەبووە کە لەودیو سروشت و هۆکارەکانەوە خودایەکی خوڵقێنەر هەیە و بەسەریاندا زاڵە، بەڵکو ڕێککەوتە کەڕ و کوێرەکانیان بە کردگاری هەموو شتێك زانیوە، لەگەڵ پێشەوا جەعفەر – کە یەکێك لە نەوەکانی حەزرەتی عەلییە، بەڕوونی بوونی خودا دەسەلمێنێت. پێشەوا جەعفەر کەڵەزانایەکی ئیسلامە، بەو کەسانەی باوەڕیان بە خودا نییە دەڵێت:

– ئێوە قەت سواری کەشتی بوونە؟

ئەوانیش دەڵێن:

– بەڵێ.

– بینیوتانە کە شەپۆلێك لە کەشتییەك دەدات، چۆن ورد و خاشی دەکات؟

– بەڵێ.

یەکێکیان بەم جۆرە درێژەی دەداتێ:

– لە ڕۆژێکی زریاناویدا، سواری کەشتییەك بووم. بایەکی بەتین هەڵی کرد و کەشتییەکەی بە گاشە بەردێکدا کێشا، هەر پارچەی بە

لایەکدا برد و گەشتیارەکانی سەری هەڵدایە ناو دەریاکەوە. من خۆم بە دارێکەوە گرت، بەڵام دواتر شەپۆلێکی تر هات و دارەکەی لە دەست دەرهێنام، منیش کەوتمە بن ئاوە شڵەقاوەکەوە...

لێرەدا پێشەوا جەعفەر قسەی پێدەبڕێ و دەڵێ:



- یەکەم جار کەشتییەکە و گەشتیارەکانی ناوی ورەیان پێ دەدایت، کە ئەوان ژێر ئاو کەوتن تۆ ئومێدت بە دارەکە هەبوو، باشە کە ئەویشت لە دەست نەما، چیت کرد؟ ئایا بێ ئومێد بوویت و خۆت ژێر ئاو خست، یان هێشتا ئومێدی ڕزگار بوونت مابوو؟

- هەر چەندە هیچ ئاماژەیەکی ڕزگار بوونم نەبوو، بەڵام هێشتا خوازیاری ڕزگار بوون بووم و بەو ئومێدەوە بەبێ وچان پەلەقاژەم دەدا.

– باشە، ئەگەرچی هیچ هێمایەکی ڕزگار بوون نەبوو، بەڵام تۆ هەر لەو باوەڕەدا بوویت ڕزگارت دەبیٚ. باشە ئومێدت بە کیٚ هەبوو بە هاناتەوە بێت و ڕزگارت بکات؟

– نازانم، هیچم بۆ نایەت!

– ئەوەی لە کاتێکدا هیچ هیوایەکی دەرباز بوونت نەما، هانی دەدایت بۆ وچان نەدان و بیٚ ئومێدی نەدەکردی، خودای گەورەیە. هەر چەندە کە دەرباز بوویت کەوتییە نکوولّی لێکردنی، بەڵام لە تەنگانەدا دڵەکەت بوونی ئەو پشتڕاست دەکاتەوە.

## دوو مۆمیش بۆ من دادەگیرسێنیت؟



لەگەڵ خانمە یاریدەدەرێکی پرۆفیسۆردا لەسەر ئەم مەسەلەیە گفتوگۆمان بوو، وتی:

–دەزانی کە منیش لە ئامادەیی بووم بێدین بووم؟ مامۆستای فەلسەفەمان زۆر بێدین بوو کاری کردبووە سەر گشتمان، هەموومانی هەڵگەڕاندبووەوە. ئەو کات لە پاریس قوتابی بووم و تا بڵێی لە ئاینەکەم نەشارەزا بووم. بەتایبەتی لەدوا پۆلدا عەجیب دەمم لە

بێدینی دەکوتا. بەڵام زۆر سەیر بوو، هەموو جارێك كە وتارم دەدا لە ناخەوە زۆر هەستم بە پەشیمانی دەکرد و لە دڵەوە دەموت: "بمبەخشە، بمبەخشە".

ئان و ساتی تاقیکردنەوەکانی کۆتایی ساڵ بوو. لە ڕۆژانی پێش تاقیکردنەوەی ئەو وانانەی کێشەم تیایاندا هەبوو، وەکو هاوڕێ دیانەکانم دەچوومە کڵێسا، لەوێ مۆمم دادەگیرساند و نزای سەرکەوتنم دەکرد. ئەگەرچی خۆم بە بێباوەڕ دادەنا، بەڵام خۆمم لەچوونە کڵێسا پێنەدەگیرا. بۆیە لای هاوڕێکانم خۆم بە شەرمەزار دەزانی و ڕوویانم نەبوو. ئەوان لە من زیاتر لە بێباوەڕییاندا ڕاستگۆ بوون، هاوپۆلێکم کە کچی باڵیۆزی هەنگاریا بوو، بە بێباوەڕترین کەس ناسرابوو. ڕۆژێك لە بەردەم کڵێسا بینیمی زۆر هەستم بە شەرمەندەیی کرد بەڵام بەسەر خۆممدا نەهێنا، لێی پرسیم:

– ئەوە بۆ کوێ دەچیت؟

– دەچمە کڵێسا، مۆم دادەگیرسێنم.

– دەتوانم داوایەکت لێبکەم؟ تکایە دوانیش بۆ من دابگیرسێنە.

واقم وڕما، ئەو قسەیەی بەجددی بوو. داواکەیم بەجێ گەیاند، بەڵام لەوساوە بۆم دەرکەوت کە بێباوەڕان لە بێباوەڕییاندا ڕاست ناکەن، ئەوانیش لە ناخەوە هەڵگری بیروباوەڕێکن.

لێم پرسی:

– باشە چۆن لە بێباوەڕی ڕزگارت بوو؟ چۆن خودات دۆزییەوە ؟

– هەر وەك بۆم باس كردییت، هەر جارێك باسم لە نكوولّی كردن لە خودا دەكرد، ترسێكی لە ڕادده بەدەر دایدەگرتم. ئەو ترسە هێندە بەهێز بوو چۆكی پێدادەدام، خۆم پێنەدەگیرا نەڵێم: "بمبەخشە". دوای ئەوەی بە هەست كردن بە پەشیمانییەكی زۆرەوە لەبەر خۆمەوە دەموت: "بمبەخشە، بمبەخشە"، تا ڕاددەیەك هەستم بە حەسانەوە دەكرد.

دواتر دەموت:

– باشە ئەگەر خودا بوونی نییە، ئەی ئەم ترسە بە چۆك هێنەرە چییە؟ لە كێ و لە كوێوە دێت؟ بۆچی دەترسم؟ كەس لە شتێك دەترسێ بوونی نەبێت؟ مادام ترس لە شتی نەبوو نییە، كەواتە خودایەك هەیە.

بەڵێ، دوای ماوەیەك وتم: "خودا هەیە" و ئیی دی ڕزگارم بوو. ئێستاكە زۆر ئاسوودە و دڵخۆشم. لە خودا بە زیاد بێ كەموكوڕییەكانم پڕ كردەوە و ناخم كامڵ بوو.

## بوار نییە بۆ نکووڵی کردن

زانایەکی تر دەگێڕێتەوە:

"ئەز باوەڕم بە بوونی خودا نەبوو، بەڵام تەنانەت لەو کاتەدا کە بێباوەڕیم لە چڵەپۆپەدا بوو کە دەگەڕامەوە زێدی خۆمان دەچوومە سەر گۆڕی باوکم. خۆم پێنەدەگیرا فاتیحەی بۆ نەخوێنم. هەموو جارێك بە خۆمم دەوت: باشە بۆ فاتیحە دەخوێنم؟ کە من بێباوەڕم ئەم فاتیحە خوێندنە چییە؟ بەڵام هەرگیز جارێك نەبووە، خۆم پێگیرابێ فاتیحە نەخوێنم..."

بەڵێ، ئەوەندە هەیە کە تەنانەت لە دڵێکی بە خۆڵەمێش بوویشدا، بوونی ئەو دەورووژێت و خۆی دەردەخات و باوەڕ دەدرەوشێتەوە.

یەکێکی تریش کە پەی بەمە بردبوو، باسی چۆنیەتیی باوەڕهێنانی خۆی بۆ دەگێڕامەوە، پێم وت:

- دەتوانی پوختەی ئەو هۆکارانەم بۆ باس بکەیت کە وایان لێکردی باوەڕ بە خودا بێنیت؟

– ئەوەی وای لێکردم باوەڕ بە بوونی خودا بێنم، بوونی خودا بوو. واتە هیچ بیانووێکم بۆ نکوولّی کردن لە بوونی نەدەدۆزییەوە. بوونی ئەو ئەوەندە ڕوونە، دڵم ئەوەندە حەوجەی باوەڕ پێبوونییەتی نەمتوانی بڵێم بوونی نییە. یەکەمین و سەرەکیترین هۆکاری باوەڕ پێهێنرانی، خودی خۆیەتی.

بەڵێ، بە دەستەواژەی کۆن: «ئەوەندە ڕوونە، لە ڕوونیدا لێڵ بووە». واتە ئەوەندە بەڕوونی دەبینرێت وای لێهاتووە نەبینرێت. ئەها وەك چۆن هەندێك جار لەبەر ڕەونەقداریی، ناتوانین لە هەتاو بڕوانین. ئەگەر بشوێرین تێی بڕوانین، لەبەر چاومان ڕەش دەبێت و نابینین.

ماوەتەوە بڵێین: کاتێك باوەڕداری و بێباوەڕی بەراورد دەکەین، ئایا هەق وا نییە مرۆڤ باوەڕ هەڵببژێرێت؟ مرۆڤی بێباوەڕ کاتێك ئەو هێزە مەزنە – کە هی پشت پێبەستنە – لە دەست خۆی دەدات، چەند سەرلێشێواو دەبێت؟ هەرچی مرۆڤی باوەڕدارە ئەوە لە دڵنیایی و ئاسوودەییەکی فرەدایە.

ئەو ئاسوودەیی و سەرڕەحەتییەی بڕوا و متمانە بوون و پشت بەستن بە خولّقێنەرێك – کە زانست و توانای بێکۆتایە و لە سۆز و بەزەییدا هاوشانی نییە – دەیبەخشێت، کەم نییە. لەبەر ئەوە مرۆڤی باوەڕدار سەرسووك و ئاسوودە و دڵخۆشە، بە هێنانە جێی

ئەو پەرستشانەی باوەڕەکەی دەیخاتە سەر شانی ئاسوودەیی دڵ و دەروون و خۆشیی مەعنەویی دەستەبەر دەکات.

ئەی کەسی بێباوەڕ متمانەی بە چی هەبێت و پشت بە چی ببەستێت؟ لەبەر ئەوەی دڵی پڕ نییە لە ئەوینی خودای گەورە، دڵ و گیانی بێبەرەکەت دەبێت و کەسایەتییەکی خۆپەرست و ناقۆڵا و هەڵەشەی لێدەردەچێت.

## چیمان لە باوەڕداریی دەست دەکەویت؟

لە بارەی باوەڕ بوون بە خوداوە، مرۆڤ هەر هیچ نەبێت دەبێت وەکو (پاسکاڵ) بیر بکاتەوە. ئەم زانا هێژایە دەڵێت:

" مرۆڤ بە باوەڕ بوون بە خودا هیچی لە کیس ناچێت، بەڵام بێباوەڕی بەڵا بەسەر مرۆڤدا دێنێت. چونکە ئەگەر هات و خودا هەبوو، بێباوەڕ چیی بەسەر دێت؟"

بەڵێ، ئەریێ بەڕاست، مرۆڤی باوەڕدار هیچ لەدەست دەدات؟ کەسێك باوەڕ بە خودا بێنێت و لەبەر ئەو ژیانی ڕێکوپێك بکات و خۆی لە خراپەکاریی بەدوور بگرێت و پەرستشەکان ئەنجام بدات زەرەر دەکات؟ بۆ خۆی ژیانێکی سەربەرزانەی پڕ لە خۆشی و شادی بەسەر دەبات، لەولایش بەهۆی بەجێهێنانی فەرمانەکانی خوداوە،

شایانی ئەو بەهەشتە دەبێت کە خودا گفتی پێداوە. تەنانەت ئەگەر ئەوەی کە نکووڵیکارانیش دەیڵێن ڕاست بێت و خودا بوونی نەبێت، باوەڕدار چیی لە دەست داوە؟ بەڵام ئەی ئەگەر هەبوو، حاڵی خۆیان چۆن دەبێت؟ بەهۆی ئەوەی لە دونیایشدا خۆیان داوەتە دەست ئارەزووەکانیانەوە و ژیانێکی سەرشێتانە و بێسەروبەر دەگوزەرێنن، ئەم ژیانەشیان خۆشیی تێدا نییە... بەڵێ، مرۆڤی ژیر هەر هیچ نەبێ، هەق وایە وەکو پاسکاڵ بیر بکاتەوە...



## بەندەی کێیت؟

هەستی ئاینداریی و پێویستیی باوەڕداریی، لەو کاتەوەی کە مرۆڤ دێتە دونیاوە هەیە. لەو سۆنگەیەوە باوەڕ ئەو هەستە ڕەگ داکوتاوەیە لە ناخی مرۆڤدا کە مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت دەستبەرداری ببێت، بەو مانایەی کە کاتێک خودا مرۆڤی بەدیهێناوە، لەسەر پێویستیی باوەڕ بە خودا بەدیهێناوە. بۆیە مرۆڤ نەیتوانیوە و ناشتوانێت ئەو باوەڕەی – کە بەشێکە لە بونیادی جارانی سفر بکات و لای بداتە لاوە. بەکورتییەکەی مرۆڤ ناچارە باوەڕ بهێنێت. ئاینیش بۆ مرۆڤ نەك هەر پێویستە و بەس، بەڵکو بێ ئەو نایکرێ، ئەو خۆراکە سەرەکییەیە کە مرۆڤ بێ ئەو نایەتە بوون.

باوەڕ خۆراکی دڵ و گیانمانە. گیانی بێباوەڕ کورتەبنـە و بێهێـزە، بۆیە ڕەنگە بگاتە ئاستێك نەتوانێت درێژە بـە مانـەوەی خـۆی بـدات. مرۆڤـی بێبـاوەڕ ئاسـایی نییـە، وەك بڵێـی دەسـتی لـە مرۆڤـایەتی کێشاوەتەوە و بووە بە ئافەریدەیەکی دیکە.

* * *

باسی ئەوەم بۆ قوتابییەکانم کردبوو، کە بـاوەڕ بـە خودابـوون بـۆ مرۆڤ پێویستییەکە، ناکرێ دەستبەرداری ببێـت. نزیکـەی هەفتەیـەك دوای ئەوەی ئەم باسەم بۆ کردبوون، (شوکران) کە لـە پـۆلی نۆیـەمی بنەڕەتیدا بوو، لە کاتی پشووی نێوان وانەکان هاتە لام و وتی:

– مامۆستا! تۆ لە وانەی ڕابردوومانـدا باسی ئەوەت بۆ کردین کـە ئاین پێویستییەکی بنەڕەتییە و مرۆڤ بـێ ئـەو نـایکرێ. بـەڵام دوێنـێ خزمێکی دوورمان هات بۆ ماڵمان، دەیوت: "من باوەڕم بە هیچ شتێك نییە". منیش بە پشت بەستن بەو شتانەی تۆ بـۆت بـاس کردبـووین، وای بۆ چوومە کە مرۆڤـی ئاسایی بێباوەڕ نابێت.

– شوکران! دوور نییە ئەو خزمەتان کێشەی هەبێت و لـە بـارێکی دژوار و نالەباردا بێت، چونکە هەنـدێك جـار مـرۆڤ کـە دەکەوێتـە ئـەو بارانـەوە، ڕووبـەڕووی زریـانێکی بێبـاوەڕی دەبێتـەوە، هۆکـاری سەختییەکانی ژیان و پشێوییەکان دەخاتـە پـاڵ قـەزا و قـەدەرەوە،

دەكەوێتــە نكــوولّی كــردن لــە هــەر چــییەك كــە هەیــە بــە خــودای گەورەشەوە.

– مامۆستا! ئەو وا نییە، ئەوەی كێشە بیّ نییەتی. بەپێچەوانەوە زۆر دلّخۆش دیارە. كەچی بـەردەوامیش دەلّێـت: "بـاوەڕم بـە هیچـیّ نییە، باوەڕداریی لەم سەردەمەدا كۆنەپەرستی و دواكەوتووییە".

داوام لە شوكران كرد بـە دیـداری خزمەكـەیانم بگەیـەنێت، چـونكە ئەگەر بێت و لە نزیكەوە بیناسم، ڕەنگە بتوانم شتێكی لەگەلّدا بكـەم. بەلاّم چـەند ڕۆژێـك دواتـر، شـوكران پێـی ڕاگەیانـدم كـە خزمەكـەیان نایـەوێت بمبینــیّ. زۆرم پــیّ ســەیر بــوو، تـۆ بلّێـی لەبـەر چـیی بێـت. شوكران دوای چەند ڕۆژێكی تر هۆكەی زانی، وتی پێی وتوومە:

– بۆ دەبیّ لەگەلّ مامۆستای ئایندا بەیەك بگەین؟ مـن پێشـتریش پێم وتبووی بـاوەڕم بـە هـیچ شـتێك نییـە. تـۆ بـەهۆی دینداریتـەوە لەگەلّم دەكەوتیتە بێنـە و بـەردە و بـە قسـەكانم نیگـەران دەبوویـت. دلّنیام مامۆستاكەشت قسـەی لەگەلّدا بكـەم نیگـەران دەبێـت و دلّـی دەشكێت.

بە شوكرانم وت قەی ناكا با دلّیشم بشكێنیّ، بەلاّم مـن هـەر دەبـیّ پێی بگەم. ئەوە بوو دوای هەفتەیەك لـە مـالّی شـوكراندا لەگـەلّ ئـەو كەسەدا بەیەك گەیشتین. بەلاّم ئەم پیاوە –كە نـاوی (ئیلتـەن) بـوو– بەر لە هەر شتێك وتی:

- تکایە با دوور لە باسی دین و ئیمان قسە بکەین.

دەست پێکردن بەم قسەیە ئەوەی دەگەیاند کە بڕوای بە بیر و بۆچوونەکەی خۆی نییە، بۆیە نەیدەویست خۆی لەقەرەی ئەو باسە بدات. کەوتینە باسی ئاو و هەوا، بەڵام باسەکە هەر هاتەوە سەر مەسەلەی باوەڕ. ماڵەکەش حەزیان لێبوو بچینە سەر ئەو باسانە.

وتم:

- کاک ئیلتەر! ئەگەرچی حەز بەو باسە ناکەیت، بەڵام خۆ وا دەبینیت قسە بۆ هەر لایەک دەبەین، هەر دێتەوە سەر باوەڕ. بە ڕوخسەتت با کەمێک ئەو باسە بکەینەوە.

ئەندامانی ماڵەکەش وتیان:

- دەی یەڵلا با قسەی لەسەر بکەین. خۆ هەر جارێک ئەم کاک ئیلتەرە بێتە ئێرە ئەو باسە دەکاتەوە و لەگەڵ شوکرانی ئێمەدا دەبێتە شەڕیان. حەز دەکەین لەم بارەیەوە گوێمان لە تۆیش بێت.

بەم قسانە کاک ئیلتەر هەڵسایە سەر پێ و وتی:

- کە وا بوو ڕوخسەت بە من بدەن بڕۆم... من نامەوێ ئەمڕۆ قسە لەسەر ئەم بابەتە بکەم.

بەزۆر دامنیشاندەوە، پێم وت:

- منیش حەز ناکەم قسە بۆ یەکێک بکەم ئامادە نەبێت گوێم لێبگرێت، بەڵام ئەگەر بە زەحمەتی نازانیت، حەز دەکەم بزانم بۆچی

ئەو بابەتی باوەڕەی هەموو جارێك قسەی لەسەر دەكەیت، ئێستا ئامادە نیت لای من قسەی لەسەر بكەیت؟

ماوەیەكی باش بێدەنگ بوو و كەوتە بیركردنەوە. ئینجا وەك ئەوەی بەزۆر قسەی پێ بكرێت، وتی:

– قوربان گیان! من باوەڕم بە هیچ شتێك نییە. پێم وایە هەموو بیروباوەڕێك پڕوپووچە، باوەڕداریی كۆنەپەرستییە و لەم سەردەمەدا جێی نابێتەوە. نابینی پارە و ماڵ و سامان چارەی هەموو كێشەیەك دەكەن؟! چ ئیشێك جێبەجێ نابێت، بە پارە دەبێ. هیچ دەرگایەكی داخراو نییە پارە نەیكاتەوە. بەكورتییەكەی لە پارە بەولاوە هیچی ناناسم. پێشان باسی هێزی باوەڕ دەكرا كەچی ئەمڕۆ باس باسی هێزی پارەیە. پارەت هەبێت هەموو شتێكت هەیە... هەموو خەڵك بەندە و نۆكەرتن. ئەگەر نەشتبێت لە خۆت بەدبەختتر نادۆزیتەوە، ژیانت بەفیڕۆ دەڕوات. با درێژەی نەدەمێ، لای من تەنها پارە گرنگە. ئێوە كە بە باسوخواسی باوەڕەوە خەریكن، دڵنیام ئەگەر كارێكی دیكەتان دەست بكەوتایە خۆتان بەمەوە خەریك نەدەكرد. ناپلیۆن چی دەڵێ؟:"پارە، پارە، پارە". بەڵێ ئێستایشی لەگەڵدا بێت ئەوەی لەم دونیایە حوكم دەكات و هەموو شتێك لە نەبوونەوە دێنێتە بوون تەنها پارەیە. من شتێكی تر شك نابەم...

لە بەرانبەر ئەم دەمار هەڵسان و قسەـ ڕەقانەیدا، وتم:



- شـوکران بەهەڵە باسی تۆی بۆ کردبووم، بگرە خۆیشت بەهەڵە لە خۆت گەیشتوویت! چونکە پێت وایە بێباوەڕیت و باوەڕت بە هیچ شتێك نییە، وەلێ ڕاستییەکەی ئەوەیە تۆش باوەڕت بە شتێك هەیە، کە ئەویش پارەیە و، ئەو سیفەتانەی ئێمە بۆ خودا دانمان پێداناون، تۆ دەیاندەیتە پاڵ پارە.

بە دەستەواژەیەکی دی پارەت لە جێی خودا داناوە. چونکە بە بۆچوونی ئێمە خودا ئافرێنەری هەموو شتێکە و هەر ئەویش بەسەر هەموویاندا زاڵە. بەڵام تۆ پێت وایە ئەوە پارەیە وایە... ئێمە پێمان وایە هێز و توانای خودا بێکۆتایە، تۆ پێت وایە هی پارە... کورتییەکەی ئێمە خۆمان بە بەندەی خودا دەزانین، بەڵام تۆ خۆت بە بەندەی پارە دەزانیت. هەر بۆیە تۆیش هەڵگری بیروباوەڕێکیت، بەڵام بیروباوەڕێکی هەڵە... چیدی مەڵێ باوەڕم بە هیچ شتێك نییە.

کاك ئیلتەر وتی: "ڕەنگە وا بێت" و هەڵسا و لێیدا ڕۆیی. منیش بە شوکرانم وت:

- بیر و بۆچوونەکانی ئێمە هیچ هەڵەیەکیان تێدا نییە... خۆ دەبینیت، تەنانەت ئەو کەسەی بانگەشەی ئەوەش دەکات کە باوەڕی بە هیچ شتێك نییە، لە ڕاستیدا باوەڕی بە شتێك هەیە، وەلێ پەی بە باوەڕدارییەکەی نابات. بەم جۆرە لەم سەر زەوییەدا کەسێك نابینیتەوە بێباوەڕ بێت. ئیی تر هەیە شوێن بیروباوەڕی هەڵە کەوتووە، هی وایش هەیە لە نەفامی و نەزانییەوە سیفەتەکانی خودای گەورەی داوەتە پاڵ شتانی دی.

- بەڵام مامۆستا! باشە بۆ دەبێت لەم سەردەمەشدا خەڵکی هەڵەی وا بکەن؟ هەر چۆنێك بێت با چاو لە بەندایەتی کردنە گاڵتە ئامێزەکانی سەردەمانی کۆن -وەك بت پەرستی- بپۆشین، بەڵام چۆن دەبێ ئێستا و لەم سەردەمەدا شتی وا بکرێ؟...

بەو پێیەی هێشتا زمانی تەتەڵەی دەکرد، پێدەچوو شوکران هێشتا بەسەر تووڕەیی لە کاك ئیلتەر زاڵ نەبووبێت.

- کچی خۆم! هەر چەندە مرۆڤی ئەم سەردەمە بە چاو هی جاران لە گەلێك ڕووەوە پێشکەوتووترە، بەڵام لە هەندێك ڕووەوە هەنگاوێکیش چاخە یەکەمینەکانی تێنەپەڕاندووە. بۆ نموونە: سەیری کاك ئیلتەر بکە خوێندوویەتی و بووە بە ئەندازیارێکی گەورە، بەڵام لە مەسەلە ئاینییەکاندا لە بنی بنەوەیە! لەسەر ئەم مەسەلانە نە شتێکی خوێندووەتەوە و نە بیرێکی جیددییشی لێکردووەتەوە. لە

قوتابخانـه و خێزانیشـدا هیچـی لـێ فێـر نـەکراوە. وای لێهـاتووە سەرەڕای ئەوەی ئەندازیارێکی گەورەیە، بـەڵام لـە مەسـەلەی بـاوەڕ هەر ئەوەندەی منداڵێکی گچکە تێدەگات...

لێرەدا شوکران هاتە گۆ:

– وەڵڵاهی مامۆستا! منداڵێکی گچکەش لەو زیاتری لێ دەزانێـت. ئەوەتا برازا حەوت ساڵانەکەشم سەری لە بوونی خودا دەردەچێت!



– شـوکران! مێشـکی خـۆت بـە کـاک ئیلتـەرەوە خـەریك مەکـە، چونکە ئەوە هەر ئەو نییە کە لە مەسەلەی باوەڕ ناگـات. نابینیـت لـە هیندستاندا مێشتا مانگا دەپەرسترێ؟ مەگـەر مانگـا بـە خـودا زانـین کەم گاڵتەجاڕییە؟! خۆ ئەوانیش نەوەی ئەم سەردەمەن.

شوكران ديسان خۆی پێنەگیرایەوە و وتی:

– بە خودا مامۆستا! ئەمانەش لە كاك ئیلتەر چاكتر نین... ئەگەر زیاترت لێ بپرسم، هەر مەگەر خودا بزانێ چ گاڵتەجارییەكی دیكەی سەردەممان بۆ باس دەكەیت!

– ڕاستە، شوكران! ئەم سەردەمە لەم بارەیەوە گاڵتەجاریی وای تێدایە ئەقڵ نایبڕێت... ئەگەر باسی ئەوەت بۆ بكەم كە لە وڵاتێكی پێشكەوتووی وەك ئەمریكادا كەسانی وا هەن، ئاگر و شەیتان و دار و گێلەپیاو دەپەرستن، باوەڕ دەكەی؟! هیچ گومانت نەبێ لەوەی لەو جۆرە مرۆڤانە هەن...

هەموو ئەمانە ئەوە دەردەخەن كە ئاین و باوەڕداری لە پێویستییە سەرەكی و بنەڕەتییەكانی مرۆڤن. مرۆڤ هەرگیزا و هەرگیز بێ ئەو نایكرێ.

مرۆڤ ئەگەر ئاین و باوەڕی ڕاست نەدۆزێتەوە –وەكو ئەو برسییەی لە برسا پڕ دەداتە دار و بەرد– پەنا بۆ ناماقووڵترین بیروباوەڕ دەبات، چونكە ناتوانێت بێباوەڕ بێت.

بۆیە ئێمە لە بەرانبەر ئەوەی نەكەوتووینەتە شوێن ئەو بیروباوەڕە بێمانا و قۆشمانە و، بەڵكو لەسەر دوایین و ڕاستترین ئاین كە ئیسلامە هێنراوینەتە بوون، چەند شوكرانەی خودای گەورە بكەین هەر كەممان كردووە.

لە وانەی ئاینی دوای ئەم دانیشتنە، ئەرکێکم بە قوتابییەکان سپارد. ئەرکەکە ئەوە بوو بەدوای ئەو شیعرانەدا بگەڕێن کە بوونی خودا دەسەلمێنن، دواتر بێن و بەڕیز لە پۆلدا بیانخوێننەوە. گفتی ئەوەشم پێدان ئەو قوتابییەی شیعرەکەی بە دڵی زۆربەی قوتابییان بێ، کتێبێکی بە دیاری پێشکەش دەکەم.

پاشی هەفتەیەک، یەکێك لەو دە شیعرەی لە پۆلدا خوێنرانەوە، زۆرینەی دەنگەکانی بەدەست هێنا. شیعرەکە (مەتین) هاوردبووی و هەر خۆیشی خوێندییەوە، بەڕاستی شیعرێکی خۆش بوو. لەسەر داوای زۆرینەی قوتابییان شیعرەکەم لە دەفتەرەکانیاندا پێنووسینەوە. وا بزانم ئێوەش تامەزرۆی بوون، وا نییە؟ دە مادام با ئەویش بخەمە نێو یادداشتنامەکەمەوە. بزانم ئێوەش پێتان خۆش دەبێت؟

# خۆشەویستیی خودا*

کێیە بەیانییان سەر لە نوێ جارێکی تر دێنێتەوە
خۆری گەش نمایش دەکا و دونیا ڕووناک دەکاتەوە؟
شەوان ماهی نووریـن، هێمن بەسەر دەریادا ڕادەکشێ
کێیە ڕۆژانە ئەم کارە وەك خۆی دووپات دەکاتەوە؟

ئەو نەمامەی لە زستاندا وا ئەزانیت کە مردووە
بە ئەمری کێ جارێکی تر بەهار چرۆی پێ کردەوە؟
بولبول پڕ بە دەنگ دەخوێنێ و دارستان دەکاتە لانەی
کێ ئاواز و سەدا و نەزمی، ئا بەم جۆرە پێبەخشیوە؟

هەستی ڕێز و خۆشەویستی بۆ ئێوە، لەلایەن دایکتان
یاخود دەنگی شیفابەخشی دڵ و دەروون، هەم ڕۆحتان
چ وانەیەك هێندە جوانە، هەمیشە ڕووی لە دڵتانە
گشت ئەم هەموو مانای مانە، ئەوە کێ دەیبەخشێ پێتان؟

ئەو دەمـــەی هێشـتــا نـازانـن مـانای گـەل و نیشـــتمان
خۆشەویسـتی و سـۆزی ئەوان، دەخـاتە نێو پـەڕەی دڵتــان
کێیــــە ئومێــدی هێنـــانی دەخـاتــە نێــو دڵتــانەوە
کـە دەکـەن داواکـاریـــی شـتێکـی جــوان لــە بــاوانتان؟

کـە مەغریب دێ و تاریکی لەگەڵ خۆی دێنێ، ئـەوە کێیـە؟
ئاسمانێك پڕ ئەستێرەی جوان، ڕووناکی و هەم نووری پێیـە
ئـەوەی کـە ورد و درشـتی گشـــت ئەمــانەی هێنایـە بـوون
بەدیـهێـنـەر و جوانـکـاریـان، بێشـك هــەر تەنهـا خودایـە[1]

**ئیبراهیم عەلائەددین گۆڤسا**

---

١- شاعیری هەست ناسك مامۆستا (گۆران عەباس) ئـەم شـیعرەی بـە دەسـتکارییەکی کەمەوە سەر لە نوێ هۆنیوەتەوە.



## بۆچی ناتوانین خودا ببینین؟

دوای ئەوەی مەتین شیعرەکەی زۆر بەجوانی و هەست بزوێنییەوە خوێندەوە و قوتابییەکانیش لە دەفتەرەکانیاندا نووسییانەوە، (ئەردەم) کە لە هەموویان زیاتر بەمەراق بوو، دەستی بەرز کردەوە:

– بڵێ ڕۆڵە.

– مامۆستا! ئەگەر توورە نەبیت، دەمەوێت پرسیارێک بکەم.

– ئەردەم! تا ئێستا بینیوتە لە پرسینی هیچ پرسیارێک توورە ببم؟!

– نەخێر مامۆستا! تۆ بە هیچ پرسیارێک توورە نابیت، بەڵام دوور نییە بەوەی ئێستا دەیپرسم توورە ببیت. چونکە پرسیارەکەم دەربارەی شتێکە کە تا ئێستا لە هەموو شتێک زیاتر باست کردووە.

– ئەردەم! بە پرسیارەکەت توورە نابم، مادام لە شتێکیشە کە زۆرم باس کردووە ئەوە هەر توورە نابم. باسێك زۆر لەسەری ڕۆیشتبم، مانای وایە گرنگترین باسە. من بۆ نموونە زۆر لەسەر باسی باوەڕ بە خودا ڕۆیشتووم. ئەگەر پرسیار لەسەر ئەمە بکەن، نەك هەر توورە نابم، بەڵکو بەپێچەوانەوە زۆریش سوپاستان دەکەم. چونکە تا ئەو کاتەی بەباشی خودا نەناسرێ، بوون بە موسڵمانێکی تەواو مەحاڵە. یەکەمین و سەرەکیترین بابەت لە ئاین و باوەڕیشدا، هەر باوەڕبوون بە خودایە. مرۆڤ بەدیهێنەری خۆی وەکو پێویست نەناسێت چۆن دەتوانێت بژی؟ بۆ کەسێك ئەقڵی لە جێی خۆی بێت گەورەترین کەموکوڕی ئەوەیە بەو خودایە نەزانێت کە ئەوی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون.

لەم گۆشەنیگایەوە، چاوەڕوانی هەموو پرسیارێکتانم کە ببێتە هۆی باشتر ناسینی کردگاری مەزنمان. چونکە من دەمەوێت ئەم بابەتە بەتەواوی لە دڵ و مێشکتاندا جێی خۆی بگرێ. باوەڕ هێنان بە خودا گەورەترین و گرنگترین هەقیقەتە. ئێمەی مرۆڤیش گرنگترین و لەپێشترین ئەرکی سەرشانمان، ناسینی و باوەڕ پێهێنانییەتی. ئەمە گەورەترین ئامانجی ژیانیشمانە.

دەی ئەردەم، چاوەڕوانی پرسیارەکەتم...

- مامۆستا! ئەوە دوو ساڵە بە چەندین نموونەی جۆراوجۆرەوە باسی بوونی کردگارمان بۆ دەکەیت. وا هەست دەکەم من و سەرجەم هاوڕێیانیش بابەتەکەمان باش هەرس کردووە. بەڵام پرسیارێك مێشکمی تەنیوە، ئەویش ئەوەیە:

**«ئەو خودایەی هیچ گومانێك لە بوونی نییە، بۆچی ناتوانین بە چاوانمان بیبینین؟»**

ئەگەر لەبری ئەوەی بە نموونەگەلی زۆر و دوور و درێژ بوونی دەربخرێ، بمانتوانیبایە بوونی خۆی ببینین باشتر نەدەبوو؟ ئەوسا هەموو کەسێك بیویستایە و نەیویستایە، ناچار دەبوو دان بە بوونیدا بنێت.

- ئازیزەکانم! لە دڵەوە سوپاسی ئەردەم دەکەم بۆ ئەم پرسیارەی. چونکە هەلی ئەوەی بۆ ڕەخساندین، جارێکی دی سەراپای بابەتێکی زۆر گەورە و گرنگ دووبارە بکەینەوە. ئێستا با لە پرسیاری **«بۆچی ناتوانین خودا ببینین؟»**ەوە دەست پێبکەین...

ئەوە ڕاستە کە لەم دونیایەدا، ناتوانین بە دیدەکانمان زاتی خودا ببینین. ئایا ئەگەر بمانبینیایە باشتر نەدەبوو؟ نەخێر باشتر نەدەبوو، چونکە ئەم دونیایە شوێنی تاقیکردنەوە و هەڵسەنگاندنە. ئایا ئەگەر وەکو ئەوەی ئەردەم دەیڵێ؛ خودامان بە چاوانمان بدیبایە، هیچ بەهایەك بۆ تاقیکردنەوەی باوەڕ بەخودا دەما؟ لەبەر

ئەوەی بەڕوون و ئاشکرایی دەبینرا، هەموو کەسێك بیویستایە و نەیویستایە دەبوایە باوەڕی پێبهێنایە. بەم جۆرەش هیچ بەهایەك بۆ باوەڕ پێهێنانی لە ڕێی خستنەگەڕی ئاوەز و دونیایەك ڕێی زانستی نەدەما.

حەز دەکەن با وا بیر بکەینەوە: ئەگەر ئەستێرەکان هەموو شەوانێك چەشنی تابلۆ ڕووناکەکانی ڕیکلام، بیاننووسیبایە خودا هەیە، کێ دەیتوانی بڵێت نییە؟ گومانی تێدا نییە کە هەموو کەسێك ناچار دەبوو باوەڕ بێنێ، وەلێ ئەم باوەڕ هێنانە هیچ سەنگێکی نەدەبوو لە هەڵسەنگاندن و تاقیکردنەوەی مرۆڤدا. بەم شێوەیەش تاقیکردنەوەی دونیایی تێکدەچوو. ئەمە وەك ئەوە دەبوو پرسیارێکتان بۆ بێنمەوە، بەڵام ئەو وەڵامەی کە دەمویست بیدۆزنەوە، بە جۆرێك لەسەر تەختە ڕەشەکە بمنووسیایە کە هەمووتان ببیینن! ئایا ئەو کات وەڵام دانەوەی ئەو پرسیارە نیشانەی زیرەکی دەبوو؟!

بەڵام ئەگەر هەندێك سەرەداوتان بدەمێ، ئیتر وەڵامەکە خۆتان بیدۆزنەوە ئەوە زیرەکی و ئازایەتییە. هەر وەك لەم نموونەیە ڕوون بووەوە، بە چاو بینینی خودا تاقیکردنەوەی دونیای تێکدەدا و بەهای ناسین و باوەڕ پێهێنانی کەم دەبووەوە. بەڵام لەم بارەی

ئێستادا دۆزینەوە و ناسینی ئەو خودایەی کە نابینرێ لە ڕێی ئـەقڵ و تێگەیشتنەوە گەورەترین و گرنگترین بەندایەتییە.

خـودا نایەتـە بیـنین، بـەڵام بـیر و هۆشـی پێـداوین تـا بتـوانین بیدۆزینەوە. هەر بۆیە شێتەکان ئەم بەرپرسیارێتییەیان لەسـەر شـان نییە. کەواتە یەکەم ئەرکی ئاوەزمان ئەوەیە ئەو کەسە بدۆزێتەوە کە ئەوی پێداوین.

کە قسەم گەیشتە سەر ئەمە، (شوعلە)ی چاودێری پـۆل دەسـتی هەڵبڕی. شوعلە پرسیار یان قسەیەکی گرنگی پێ نەبوایە، ئـاوا خـۆی نەدەخستە ناو قسەوە. چونکە زوو زوو پـێم دەوتنـەوە: "ڕۆڵـەکانم! ئەگـەر لـە گەرمـەی باسـێکی گرنگـدا بـووین، دەسـت هەڵمـەبڕن و نەتانەوێ قسە بکەن. چـونکە ئەمـە وەك ئـاو کردنـە بـۆ نـاو چێشـتی کوڵاو و، لیمۆ کردنە قسەی شیرین و ترشاندنییەتی."



– بڵێ، کچەکەم!...

– مامۆستا! ئایا چاو تاکە ئامرازی بینینە لە مرۆڤدا؟

ئـــەم وتەیـــە بـــەهۆی تێنەگەیشـتنیانەوە لێـی بـووە هـــۆی غەڵبـــە غـــەڵب لـــە پۆلەکەدا.

– بێدەنگ بن تا شۆعلە مەبەستەکەی زیاتر ڕوون بکاتەوە. باشە شۆعلە بە چ ئەندامێکی هەستی دیکەمان دەتوانین ببینین؟

– بۆ نموونە هەسی دەست لێدانیش دەتوانێت ببینیّ. ئەوە نییە ئەوانەی چاویان نابینایە، لە ڕێی دەستەکانیانەوە دەبینن... واتە لە ڕێی دەست لێدانەوە جۆرێك بینین بۆ خۆیان مسۆگەر دەکەن. کەواتە بەعزیّ جار هەستی دەست لێدانیشمان دەبینێت و لە شتان تێدەگات.

زمانەکانیشمان هەر دەبینن. بۆ نموونە ڕێی تێگەیشتن لە تامی هەر جۆرە میوەیەك، لە ڕێی بەکارهێنانی زمانمانەوەیە نەك ڕوانین بە چاوەکانمان. کەواتە ئەو ئەندامەی لەشمان کە تامەکان دەبینێت زمانمانە.

«ئافەرین»م بۆ شۆعلە کرد و نەکرد، مەتین دەستی هەڵبڕی:

– مامۆستا! بەو حیسابە بێت، لووتیشمان بۆن دەبینیّ، وا نییە؟ کەواتە لووتیش چاوی بۆن کردنە.

– بێگومان، وایە... ئەگەر لووتمان –کە پسپۆری بۆن کردنە– نەبوایە، نەماندەتوانی بۆنی هیچ گوڵێك بکەین. لە سایەی لووتمانەوە بۆن و بەرامەکان بەدی دەکەین.

ئیتر وای لێهات پۆلەکە هەمووی پێکەوە وتی: "گوێیش ئەو چاوەمانە کە دەنگەکان دەبینێت"، بەم جۆرە هەموو تێگەیشتن شوعلە دەیویست قسەکانی بە کوێ بگەیەنێت.

- ئازیزەکانم! باشە، چۆن دەتوانین بابەتەکەمان بەم هەموو نموونەیەوە ڕوون بکەینەوە؟ ئەوەی لە یەك ڕستەدا کورتی بکاتەوە (دە) نمرەی دەدەمێ.

وەك بڵێی، هەموو پۆلەکە دەستی بە هەواوە بوو. لەبەر ئەوەی نمرەی تێدا بوو، هەندێك هەر بە دەست بەرزکردنەوەوە نەوەستابوون، بەڵکو هەڵیشسابوونەوە سەر پێیان. ڕێگەم بە عەلی دا قسە بکات، خوا هەڵناگرێ وەڵامەکەی زۆر جوان بوو:



- مامۆستا! ئەوەی ڕاستی بێت، ئێمە خودای گەورە دەبینین. بەڵام ئەو چاوەی دەیبینێ چاوی ئەقڵمانە. وەك چۆن لە تامی سێو بە زمان، و لە بۆنی گوڵ بە لووت، و لە چریکەی مەل و ئاوازی گۆرانی بە گوێ دەگەین، ئاواش بە چاوی ئەقڵ لە بوونی خودا دەگەین... ئەندامەکانی دیکەی هەست کردنمان، بە پێدانی بەڵگە و زانیاری یارمەتیی ئەقڵمان دەدەن.

– ئافەرین عەلی! بابەتەکەت باش گردکردەوە و دە نمرەت حەڵاڵ کرد. با باسەکە بەم جۆرە بخەینەڕوو:

ئێمە لەم دونیایەدا ناتوانین خودای گەورە بە چاوانمان ببینین، وەلێ دەتوانین بە چاوی ئەقڵمان ببینین. بێگومان ئەمەش پێویستیی بە کەمێك بەکار خستنی مێشك و لێکۆڵینەوە و بیرکردنەوەی مەنتیقی هەیە. ئا ئەو کەسەی کە دەتوانێت ئەمە بکات، ئەوا لە گرنگترین وانەی ژیان دەرچووە، چونکە ئەو کات خودای – وەك ئەوەی بینیبێتی – ناسیوە و لێی تێگەیشتووە. کەواتە ئێمە خودا دەبینین، بەڵام ئەو ئەندامەی پێی دەیبینین جودایە، لەبری چاو بە ئەقڵ دەیبینین. وەك چۆن گەلێك شتی دیکەی ئەم دونیایە بە ئەندامانی ترمان پەییان پێدەبەین و لێیان تێ دەگەین...

ئەردەم کە یەکەم کەس بوو پرسیی بۆ خودای گەورە بە چاوانمان نابینین، لەگەڵ ئەوەی تەنیشتی قسەی دەکرد، پێدەچوو شتێکی تریش هەبێت بووبێت بە ماخۆڵانی مێشکی و سڵ بکاتەوە لە پرسینی...

– ئەردەم! خەریکە ڕێککەوتنەکە پێشێل دەکەیت. ئەی بڕیار نەبوو هەر پرسیارێکت هەبوو بێسڵەمینەوە بیکەیت؟!

– مامۆستا گیان! باش لەوانە گەیشتم کە باستکردن، بەڵام دیسانەوە خۆم پێناگیرێت لەوەی بڵێم خۆزگە خودای گەورەمان بە

چاو ببینیایە، چونکە زۆرم مەراقە... ڕەنگە کەمێك هەست بزوێن بێت، بەڵام ئەگەر بە چاو بماندیتبا... بەڕاستی من زۆر حەزم لێیە...

– ئەردەم! با ئەم بۆچوونەت هەست بزوێنیش بێت، بەڵام خۆ عەیبەی تێدا نییە. بێگومان مرۆڤ پەرۆشی پەروەردگارییەتی و دەخوازێت لە نزیکەوە بیناسێت، بەڵام ئەوەی ئێمە لێرەدا گەرەکمانە باسی بکەین ئەوەیە کە ئەمە لە دونیادا چۆن دەبێت و تا چەند ڕێی تێدەچێت. بێگومان ئەوینی خودا لە دڵتدا هێندە زۆرە، بۆیە هەر بە بینینی بە چاوی ئەقڵت، دڵت داناکەوێت.

سەردەمانێك حەزرەتی مووساش (سەلامی خوای لێ بێ) کە یەکێکە لە گەورەترینی پێغەمبەران، دڵخوازی ئەوە بووە لە دونیادا خودای گەورە بە دوو چاوانی ببینێت. خودای گەورەش پێی وتووە کە ناتوانێت بەو چاوانەی لە دونیادا بیبینێت. بۆ ئەوەی دڵیشی دابکەوێنێت، فەرمانی پێداوە بڕوانێتە کێوەکەی بەرانبەری. کاتێك حەزرەتی مووسا سەری بەرز کردووەتەوە و ڕوانیویەتی، بینیویەتی کێوەکە بە دەنگێکی بەرزەوە شەق بووە. هەڵبەتە لە ئاست سامداریی ئەو دیمەنە یەکسەر کەوتووە و لە هۆشی خۆی چووە. بۆیە بەتەواوی گەیشتووەتە ئەو قەناعەتەی کە ناتوانێت بەو چاوانەی خودای گەورە لە دونیادا ببینێت. ئەو دیبانەی ئێمە ئەو توانایەیان نییە تەنانەت زۆرێك لەو شتانەی کە دڵنیاین هەن بەدی بکەن. لەبەر

ئەوەی کە بونیادی چاومان ئەوەندە سنووردارە زۆرێک لەو شتانەی لە باریدا نییە بیانبینێت، بە ئەندامگەلی هەست کردنی تر و ئەقڵمان پەییان پێدەبەین و ناچار دەبین دان بە بوونیاندا بنێین. بۆ نموونە: ئایا دەتوانن چەوریی ناو شیر ببینن؟ ئەی ئەگەر لە بابایەکی شیر فرۆش بپرسن: ئەرێ شیرەکەت چەوریی تێدایە و، کاتێکیش وەڵامی "بەڵێ"تان وەرگرت بێژن: "کوا؟ پێمانی پیشان بدە"، چیتان پێدەڵێت؟!

باشە چۆن دەتوانن چەوریی ناو شیر ببینن؟

– بەوەی بیکوڵێنین و تامی بکەین...

– بێگومان وایە... چەوریی شیر، زمانمان دەیبینێت نەک چاوانمان... ئایا بە ڕوانین لەو چایەی کە یەکێک خەریکە دەیخواتەوە، دەتوانن بزانن چەندە شەکری تێدایە؟

– نەخێر...

– بێگومان نەخێر، چونکە تەنها بە تام کردن دەزانین چایەک چەنێک شەکری تێدایە... باشە، چیی تر هەیە کە دڵنیاین لە بوونی بەڵام بە چاو نایبینین. پێم بڵێن بزانم...

– مامۆستا! پۆلەکەمان پڕ لە هەوایە، بەڵام ئەویش بە چاوانمان نابینین.

– ئەی دەكرێت نكوڵی لە بوونی ئەو هەوایە بكەین كە بەردەوام بۆ نێو سییەكانمان هەڵیدەمژین؟

– نەخێر، نەشیبینین هەر هەیە...

– مامۆستا! خۆی لە خۆیدا گشت بوونەوەرە مەعنەوییەكان نایەنە بینین... هەستەكانیشمان نابینرێن... بۆ نموونە: وەك چۆن ناتوانین ئازار و ناڕەحەتی و دڵتەنگیی هاوڕێیەكمان ببینین، بە هەمان شێوە ناتوانین دڵخۆشییشی ببینین. ئێستا ئەگەر هاوڕێیەكمان بڵێت "خەریكە لە خۆشییا بفڕم"، پێی دەڵێین كوا ئەو خۆشییەت، پێمانی پیشان بدە، ئەگەر نا باوەڕت پێناكەین؟ نموونەیەكی تر: ئایا كەمێك لەمەوبەر كەیف خۆشیی عەلیمان بینی؟ ئەی خۆ بانگەشەی ئەوە ناكەین كە وێڕای ئەوەی «دە»ی هاورد، هیچ كەیف خۆش نەبوو؟

– ئافەرین، ڕۆڵە! نموونەگەلی زۆر جوانت پێداین. بەڵام نموونەی تریشمان هەیە لەسەر ئەم بابەتە، كێ دەتوانێت بیانڵێت؟

– مامۆستا! كابرایەك دەچێتە لای مەلای گوندەكەیان و داوای لێدەكات باسی بوونی خودای بۆ بكات... مامۆستاش بە هەندێك نموونەوە بوونی خودای بۆ ڕوون دەكاتەوە. كابرا دوای ماوەیەك دیسان دێتەوە لای مەلا و هەمان پرسیاری لێدەكاتەوە. مامۆستاش دووبارە بۆی باس دەكاتەوە. كابرا سوپاسی مامۆستا دەكات و دەڕوات، وەلێ هەمدیس مامۆستا لەسەر مەزراكەی دەبینێتەوە. تۆ

بلێی هەمان پرسیاری لێنەكاتەوە؟! بەرێ وەڵڵا... مامۆستاش وای بۆ دەچێت كابرا گەرەكیەتی ڕاببوێرێت، كەستەكێكی وەك بەرد ڕەق هەڵدەگرێتەوە و دەیكێشێت بە تەپڵی سەریدا... كابرای نەگبەتیش بە ڕاكە ڕاك خۆی دەگەیەنێتە لای قازی -واتە دادوەری ئەوسا-...

پێی دەڵێت:

– جەنابی قازی! پرسیارێكم لە مەلای گوندەكەمان كرد، ئەویش بە كەستەك كێشانە سەرمدا وەڵامی دامەوە... خەریك بوو مێشكم بپژێ. سكاڵام لەسەری هەس...

قازی لەم كارە، هەم سەری سوڕدەمێنێ و هەمیش تووڕە دەبێت... چونكە ئەو مەلایەی لە نزیكەوە دەناسی و دەیزانی كەسێكی هێمن و لەسەرخۆیە...

بێگومان مەلاكەش بانگ دەكرێتە دادگا. قازی بەپەرۆشییەوە لێی دەپرسێت:

– مامۆستا! تۆ چۆن وەڵامی ئەم پیاوەت داوەتەوە. یەكێك داوای ئەوەت لێبكات بوونی خودای بۆ ڕوون بكەیتەوە، كەستەك دەكێشیت بە سەریدا؟

مامۆستاش زۆر بەهێمنی وەڵامی دەداتەوە:

– قوربان! من بەو زمانە وەڵامی پرسیارەكەیم داوەتەوە كە لێی تێدەگات.

- چۆن چۆنی؟

- ئـەو دوو جـار هاتــە لام، داوای کـرد بــوونی خــودا بخەمــە مێشـکییەوە. مـنـیش ئەوەنـدەی لـە توانامـدا بـوو بـۆم بـاس کـرد و چەندین نموونەم بۆ هێنایەوە، بەڵام کاتێك بۆ جاری سێیەم بۆ هەمان پرسـیار هاتـەوە، هەسـتم کـرد پێویسـتە بـە جـۆرێکی تـر وەڵامـی بدەمەوە. ئێستا تێناگەم لەسەرچی سکاڵای لەسەر من هەیە؟

قازییش ڕوو دەکاتە کابرا و دەڵێت:

- کوا بڵێ، بزانم سکاڵاکەت چییە؟

- گـەورەم! کـە سـێیەم جـار چـوومەوە لای، وەڵامـی نەدامـەوە. پارچە کەستەکێکی دا بە سەرمدا کـە وەك بـەرد ڕەق بووبـوو. ئێسـتا سەرم ئەوەندە ئازاری هەیـە، خەریکە دەتەقێت. ئایا مـافی ئــەوەم نییــە سـکاڵا لەســەر کەسێك تۆمـار بکـەم کـە ئـەو هــــەموو ئــێش و ئــــازارەی پێگەیاندووم؟



ئینجا قازی ڕوو دەکاتەوە مەلاکە و لێی دەپرسێت:

– جەنابی مامۆستا! لە بەرانبەر ئەم بانگەشانە چی دەڵێیت؟ کە باس لە پێویستیی جۆرە ڕوون کردنەوەیەکی تری هەبوونی خودا دەکەیت، مەبەستت ئەمەیە؟

– جەنابی قازی! کوا با ئەو ئێش و ئازارەی باسیان دەکات، پێمان پیشان بدات.

کابرای سکاڵاکار ئەوەندەی تر قینی لە مەلاکە هەڵدەستێت:

– جەنابی قازی! ئەوە ئەم پیاوە دەڵێت چی؟ چۆن دەتوانم ئێش و ژانی خۆمی پێ پیشان بدەم؟ ئایا ئەگەر نەتوانم پیشانیان بدەم، مانای وایە نین؟

کە قسە بەمە دەگات، مامۆستا بە قسە دێت و دەڵێت:

– ئێ ئەوەی کە منیش دەمویست باسی بکەم ئەمە بوو. واتە کە خودا نابینیت ئەوە ناگەیەنێت نییە. ناتوانیت ئەو بە چاوانت ببینیت، بەڵام لە ناختدا هەستی پێدەکەیت و بە دڵ پەی پێدەبەیت. بە ڕوانین لە ئافەریدەکان لە بوونی ئافەرید دەگەیت. سەیر بکە، ئێستا تۆ ناتوانیت ژانی سەرتمان پێ پیشان بدەیت، بەڵام من هەست بە کزەی جەرگت دەکەم.

قازی دەم بە پێکەنینەوە گوێ لەو ڕاڤە تێکەڵ بە گاڵتەیەی مامۆستا دەگرێت، دواتر هەردووکیان ئاشت دەکاتەوە و بەرەو ئاواییەکەیان بەڕێیان دەکات.

- ڕۆڵەکانم! ئەم کابرایە بە جۆرێك لە بوونی خودا تێگەیشتووە جارێکی تر لە بیری نەکات، وا نییە؟

لەم سەروبەندەدا لەنێو پۆلدا کەسانێك هەبوون کە بە گاڵتە سیخورمەیان بە یەکدا دەکێشا و دەیانویست ڕووداوی نێو چیرۆکەکە دووبارە بکەنەوە. پێم وتن:

- سەیر بکەن، دەشێ ئەم ڕووداوەی کە هاوڕێکەتان گێڕایەوە، گەلێك لە مێژ بێت ڕووی دابێت یان هەر ڕووی نەدابێت... بەڵام بۆ ڕوون کردنەوەی ڕاستییەك دەگێڕرێتەوە. بەڵام ئیتر لەم دەورانەی ئێمەدا ڕێگای ڕوون کردنەوەی ئەم ڕاستییە گرنگەش جیاوازە. واتە لەبری کێشان بە سەردا، پێویستە قەناعەت بەوەی ناوی بهێنرێت. چونکە ئەم چەرخەی ئێمە چەرخی زانست و قەناعەتە. ناتوانیت کەسێك هەر چەند بچووکیش بێت، بەزۆر و لەژێر فشار و کوتان بیهێنیتە سەر باوەڕ، چونکە ئەمە لە ئاینەکەشماندا جێی نابێتەوە. بەڵێ، بە هەر حاڵ... با بێینەوە سەر باسەکەمان. چیی تر هەیە کە چاومان نایبینێت؟

- مامۆستا! ئەقڵ و گیانیشمان نابینین. کەچی کەسیش بانگەشەی بێ ئەقڵی و بێ گیانیی خۆ ناکات.

- ئافەرین بۆ تۆ... کەس هەیە ئەقڵی خۆی بینیبێت؟ یان کەستان بینیوە گیانی خۆی بینیبێت؟

- نەخێر، نەمانبینیوە...

- بێگومـان نـەتانبینیوە و ناشـیبینن. چـونکە ئەمانـە بـوونی مەعنەویین و نایەنە بینین.

(نالان) کە لە ژیرترین قوتابییەکانی پۆل بوو، لە ناخەوە دەموت: لەم وانەیەدا هەر بێدەنگە، داوای مۆڵەتی قسە کردنی کرد:



- مامۆستا! کارەباش بە چاو نابینرێت، بـەڵام ئـەوەی بـاوەڕ بـە بوونی ناکات ئەگەر ئازایە با دەستی بۆ ببات...!

– هەر بژی، ناڵان... بێدەنگ بوویت بێدەنگ بوویت، بەڵام کە بەدەنگ هاتیت لە گۆشەی نەوەتت دا! یەکێك لە شاعیرە کلاسیکییەکانمان، دێڕە شیعرێکی زۆر جوانی لەسەر ئەمە هۆنیوەتەوە:

گەرچی چاو ئەندامی بینینمانە

کەچی لە بینینی خۆیشی، دەستەوسانە

بەڵێ، هیچ پێویست ناکات لە دوور لە نموونە بگەڕێن. بیر بکەنەوە بزانم کەسێك هەیە لە ئێوە چاوی خۆی بینیبێت؟ بێگومان مەبەستم لە ئاوێنە نییە...

بەڵێ، پێم وایە دوای هەموو ئەوانەی باسکران، بۆتان ڕوون بووەتەوە کە توانای بینینی دیدەکانمان چەندە سنووردارە، بەڵام وەك دوا شت با ئەوەش بڵێین:

بەپێی وتەی زانایان: «چاوی ئادەمزاد، لە باریدایە تەنها سێ لە سەدی تیشکەکانی ئەم دونیایە ببینێت.» ئەمە چی دەگەیەنێت؟ ئەوە دەگەیەنێت کە لەو شتانەی لەم دونیایەی لێی دەژین هەن، دەتوانین تەنها و تەنها لە سەدا سێیان ببینین. باشە، ئایا هەر چاومان ئاوا سنووردارە؟ نەخێر، ئەندامەکانی دیکەی هەستیشمان بە هەمان شێوە لە پێوانەیەکی فرە کەم و سنوورداردا پەی بە شتەکان دەبەن. ئیتر لەو حاڵەدا ئایا دەتوانین بەو چاوانەمان کە ئەوەندە

سنووردار بەدیهێنراون و لە توانایاندا نییە زۆرێك لە شتەكانی ئەم دونیایە ببینن، خودای گەورە ببینین؟ یان بڵێین لە كاتێكدا ئەو هەموو ئافەریدەیە لە گۆڕێدا بێت كە نایانبینین، داوا كردنی بینینی ئافەرید شتێكی مەنتیقییە؟ لە ئاكامدا، با دووبارە ئەوە دەرببڕمەوە كە ئێمەی مرۆڤ تەنها دەتوانین ئەو شتانە ببینین كە لە ماوەیەكی دیار كراو و لەنێو چەند شەپۆلێكی دیاری ڕووناكیدان. بۆ نموونە لە تواناماندا نییە ئەو ملیۆنان خڕۆكە سوور و سپی و زیندەوەر و میكرۆبەی لە لەشماندا دەژین، هەروەها ئەو بەكتریایانەی هان لە بنی بنەوەی ددانەكانمان و خەریكی هەڵكۆڵینیانن ببینین. لە كاتێكدا كە ئەو ملیۆنانەی لەناو جەستەماندا دەژین نابینین، بێین و داوای دیتنی خودای گەورە بكەین یان بڵێین: "نەیبینم باوەڕی پێناهێنم"، هیچ ژیرانە نییە. ئەم ڕاستییە لە قورئانی پیرۆزیشدا بەم جۆرە ڕوون كراوەتەوە: ﴿لاَ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَ هُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ﴾ الأنعام:١٠٣، واتە: « چاوی مەخلوقات هێزی ئەوەیان نییە خودا ببینن و كونهی خودایان پێ بزانرێ. خودا كونهی چاوەكان و خاوەن چاوەكانیش ئەزانێ و بە وردی ئەیانبینێ و ذەڕڕەییێكی لێ ون نابێ. ».

***

كە بەم جۆرە كۆتام بە قسەكانم هێنا، چاوم لەسەر ئەردەم بوو:

- ئەردەم! لەسەر پرسیاری تۆ ئەم باسەمان کردەوە. هەموو نیشانەی پرسیارەکانی ناو مێشکت لاچوون یان هێشتا ماون؟

بە گوزارشتەکانی دەموچاوی دیار بوو هێشتا پرسیاری مابوو، بەڵام لە پرسینیان سڵی دەکردەوە.

- دەی یەڵڵا، ئەردەم! سێیەم پرسیاریشت بکە، تا کۆتا بە بابەتەکەمان بێنین. بە پرسیاری تۆ دەستمان پێکرد با بە پرسیاری تۆش کۆتایی پێ بێنین.

ئەردەم کەمێك نازی کرد، بەڵام وەك پێشبینیم کردبوو ئەو پرسیارەی کرد کە مێشکی تەنیبوو:

- مامۆستا! مادام سووریت لەسەر ئەوەی پرسیار بکەم و بەردەوامیش باس لەوە دەکەیت کە لە هیچ پرسیارێك توورە نابیت، منیش دەپرسم:



لەوەی کە تا ئێستا باستان کرد، باش لەوە تێگەیشتم کە ناتوانین بە چاومان هەموو شتێك ببینین و بینینی خودا ئەوە هەر هیچ، بەڵام وێڕای هەموو ئەمانەش من هەر وا بیر دەکەمەوە:

ئەگەر چاوانمان وەك ئەمانەی ئێستا سنووردار نەبوونایە، بەڵکو ئەوەندە بەکامڵی دروست بکرانایە، کە

هەموو شتێکیان ببینیایە... ئەو کاتیش خودای گەورەمان ببینیایە، باشتر نەدەبوو؟

– بێگومان باشتر نەدەبوو، ئەردەم!... چونکە ئەو کات ژیان دەبوو بە شتێك قابیل بە ژیان نەبێت. چونکە ئەو چاوە کامڵەی هەموو شتێکی بە هەموو وردەکارییەکانییەوە ببینیایە، ژیانی لە مرۆڤ دەکرد بە زیندان. ئەو کەسەی چاوێکی وای دەبوو، نانی پێ نەدەخورا. چونکە هەر چەند پاك و تەمیز بوایە، ملیۆنان بوونەوەری بەسەر خواردن و خواردنەوەکانی سەر چەتاڵ و کەوچك و چەقۆوە دەبینی. با بیر لەوە بکەینەوە کە کابرایەکی وا هەیە. ئەم کابرایە نەیدەتوانی ئەو دەستەی بۆ تەوقە بۆی درێژ دەکرا بگوشێت، ئەو پارەیە وەربگرێت کە پێی دەدرا، بخوات، بخواتەوە، کەسی خۆش بوێت. لەم دونیایەدا بەو دوو چاوەی کە وەك دوو بۆشایی سامداری هاوشێوەی ڕاڕەوگەلێك بەرەو تاریکستان درێژ بووبێتنەوە دەیڕوانی و نەیدەتوانی دەست بە هیچەوە بدات، نە کاڵا و نە زیندەوەریش...

ئەگەر ڕۆژێك لەو کابرایە پرسیار بکرایە:

– ئەرێ تۆ بۆ وایت؟ بۆ وەك باقیی خەڵکی نییت، بۆ وەك ئەوان ژیان ناگوزەرێنیت؟

کابراش دەیوت:

- چاوەکانی من بە دەستی قەدەر، لە شێوە و توانای جووتە وردبینێك دروست کراون. من گشت میکرۆبەکانی سەر ئەو شتانە دەبینم کە ئێوە تا سەر ئێسقان خۆشتان دەوێن. میوانداریی پڕ لە میکرۆب، لێوانی لێوان لێو لە میکرۆب، دەستی پڕ میکرۆب، پارەی تەنراو بە میکرۆب... ئێوەش بیناییتان وەك هی من بوایە، نەتاندەتوانی بژین. شوکری خودا بکەن هەمووتان قەرزداری چاوکزیتانن.

بەڵام چی ببینم، ئەوە چییە؟ ئەردەم هێشتا دەیەوێت قسە بکات، زەنگیش لێی دا. وتم:

- دەی، ئەگەر کورتە، بیپرسە...

- مامۆستا! بمبەخشە. ئەمڕۆ زۆرم ماندوو کردیی. بڕیار بێت ئەمە دوا پرسیارم بێت.

- خۆشەویستەکانم! ئەوەی دەیەوێت دەتوانێت بڕوات، ئەوەیشی دەیەوێت دەتوانێت گوێ لە پرسیارەکەی ئەردەم و وەڵامی من بگرێت...



- مامۆستا گیان! ئێمە ناتوانین خودای گەورە بەم چاوانەمان و لەم دونیایەدا ببینین قەی ناکا، بەڵام ئایا

هەرگیزا و هەرگیز نایبینین... لە بەهەشتیشدا هەر ناتوانین بیبینین؟

– پرسیارێکی جوانت کرد. هەر هیچ نەبێت با بە موژدەیەکی خۆش کۆتا بە وانەکەمان بێنین. بەڵێ، بۆچوونەکەی ئەردەم بەجێیە. ئەگەر بتوانین بەهەشت بەدەست بێنین، ئەوە خودای گەورە لەوێ چاوێکمان بەنسیب دەکات کە بتوانین زاتی خۆی پێببینین... ئێ خۆشترین و بەتامترین نیعمەتی بەهەشتیش ئەمەیە. چونکە تامی بینینی ئەو خودایەی هەموو جوانییەکانی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون و بەو هۆیەشەوە سەرچاوەی گشت جوانییەکانە، هەموو خۆشییەکانی بەهەشت تێدەپەڕێنێت. بەڵام دەبێت بۆ ئەوە کەمێك ئارامیمان هەبێت و بە جۆرێك ژیانی دونیا بگوزەرێنین، کە سەری لە بەهەشتەوە دەربچێت.

دەی ئەردەم، با هەر لەمڕۆوە بەر لە هەر کەسێك تۆ، کە یەکێکیت لەوانەی زۆر عەودالّی دیتنی خودایت، ئینجا گشت پۆلەکە، بخەینە ناو پێشبڕکێیەکەوە لەو کارانەی کە بەرەو بەهەشتمان دەبەن. بۆ گەشتێکی ئاوا بێهاوتا، مرۆڤ چی لەبەر چاو ناگرێت، وا نییە؟ دەی ئامادەن؟

کاتێك لە نێو دەنگی زولاڵی "بەڵێ ئامادەین، مامۆستا!" پۆلەکەم بەجێهێشت، هەستم بە خۆشییەك دەکرد لە ناخمدا لە باسکردن نایەت.



## ژمارەی خزمەتکارەکانتان دەزانن؟

ڕۆژێك لە میانەی قسەکانمدا بە قوتابییەکانم وت: "من هەزاران خزمەتکارم هەیە". سەرەتا کەمێك سەریان سوڕما و حەپەسان. دواتر وتیان: "بۆ تۆ پاشایت؟" و دایانە پێکەنین، بەڵام کە من جەختم لەسەری کردەوە، کەوتنە بیر کردنەوە و هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لەوەی دەبێ مەبەستم چی بێت... بەڵام دوای ڕوون کردنەوەکانم ئەوەیان سەلماند کە نەك هەر من بەڵکو خۆیشیان ئەوەندە خزمەتکاریان هەیە لە ژمارە نایەن.

با بزانم ئێوەش هەمان بۆچوونتان دەبێت؟

با بیر بکەینەوە... ئەم زەمینە، تا چەند هەوارێکی لەبارە بۆ ژیان بەسەر بردنی ئێمە. زۆریەی هەسارەکانی دیکەی سەر بە کۆمەڵەی خۆر بۆ ژیانی ئادەمزاد دەست نادەن. زەوی گونجاوترین شوێنە بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێ ئاسوودە ببێت. هەموو شتێك ئەوەندە کامڵە و بۆ مرۆڤ ئەوەندە لەبارە!... هەر لەبەر ئەم جوانی و لەبارییەیەتی کە مرۆڤایەتی لێی ڕاهاتووە و خۆشی دەوێت. باشە ئەم زەوییە کە ئەوەندە شیاوە و لێی ڕاهاتووین و خۆشمان دەوێت لەگەڵ هەموو ئەو شتانەی هان لەسەری، بەڕێککەوت هەن؟ ئایا ئێمەی مرۆڤ بەڕێککەوت ئەم سەرزەوییە دەدۆزینەوە؟ ئایا هەموو شتەکانی سەر زەوی بەڕێککەوت بە کەڵکمان دێن؟ باشە، بۆچی زەوی و هەموو ئەو بوونەوەرانەی لەسەری دەژین لە خزمەتی ئێمەدان؟ تۆ بڵێی کێ

بڕیاری لەسەر هەموو ئەمانە دابێت؟ خۆ ناشێ مرۆڤ ئەم بڕیارەی دابێت. چونکە خۆ ئەوە نییە بەسەر گشت هەسارەکاندا گەڕابێت و زەوی بە دڵ بووبێت. ئەوەش ڕێی تێناچێت زەوی ئێمەی خۆش ویستبێت و حەزی کردبێت میوانداریمان بکات، چونکە لە ئەقڵ و بیر کردنەوەی وا، مەحرومە. هەبێ و نەبێ، دەبێ یەکێك هەموو ئەمانەی بۆ ئێمەی مرۆڤ ئامادە کردبێت و خستبێتییە خزمەتمانەوە.

ئەرێ زەوی بەو زەبەلاحییەی خۆیەوە، خزمەتکاری ئێمە نییە؟ ئینجا خزمەتکارێك کە هەزاران خزمەتکاری دیکەی لەسەر خۆی پەنا داوە... بوونەوەرێکی مەزن کە تەژییە لە ڕازگەلێك کە ئەقڵ نایانبڕێت، بە بۆشاییەوە وەستاوە و لە خولگەیەکی دیاردا بەخێرایی ۳۰ کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا بە دەوری خۆردا لە خولانەوەدایە... بە دەوری خۆیشیدا دەخولێتەوە. بە سووڕانەوەی بە دەوری خۆردا چوار وەرزەی ساڵ و، بە سووڕانەوەی بە دەوری خۆیشیدا شەو و ڕۆژمان بۆ دەکاتە دیاری. هەم چوار وەرزەکە و هەمیش شەو و ڕۆژگار تەنها لە خزمەتی مرۆڤدایە. هەر وەك هەموو ئەوەی لە ناویاندا ڕوودەدات، تەنها و تەنها بۆ ئارامیی و ئاسوودەیی مرۆڤەکانە.

کەواتە زەوی سەرایەکە بۆ میوانداریی ئێمە ئامادە کراوە. گژوگیا و درەختەکانی نێو باخچەی ئەو سەرایە، هەردەم لە خزمەتی ئێمەدان. ئیتر هەندێکیان لە خواردن سازکردندا و هەندێکیان لە

دەرمانسازیدا و هەندێکی تریشیان لە دروست کردنی کەلوپەلدا بەکار دەهێنرێن. ئەو ڕووەکانە کە سەر زەمینەکەمانیان ڕازاندووەتەوە، دیمەنیان بە چاومان و بۆنیشیان بە لووتمان جەژن دەگێڕن و ئاسوودەییمان پێدەبەخشن. باشە پێتان وایە کە بۆ ئەم خزمەتە فەرمانیان لە کێ وەرگرتووە؟

ئەرێ دەکرێ ئەم هەموو جوانییە ببینین و نەڵێین خودا چەند جوان بەدیهێناون؟ لە خودا بەولاوە، ڕێی تێدەچێ خاوەنی ئەم میوانخانە گەورەیە کێ بێت؟ ئەوەی کە ئەم زەوییە بەساڵداچووەی لە هەزاران سەدە لەمەوبەرەوە خستووەتە بەر فەرمان و خزمەتی مرۆڤ کێیە؟

ناسینی خودای گەورە بەم بۆچوونانەوە و خۆش ویستنی لە کانگای دڵەوە، سەرەکیترین ئەرکمانە، بەڵام چەند لە چەندی ئەو مرۆڤانەی سوود لە نیعمەتەکانی سەر ئەم زەوییە وەردەگرن پەی بەو جوانییانە دەبەن؟ ئەرێ چەندێك مرۆڤ لە ئاست ئەو خزمەتکار و خەڵاتە جوانانە سوپاسی خودا دەکەن؟

ئەگەر هەڵبسین بە ژماردنی جۆرەکانی ڕووەك پێمان دەژمێررێت؟ ئەی ئاژەڵان؟... ئەوانە لە خزمەتی کێدان؟ هەندێك لە ئاژەڵان بە هێز و بازوویان، هەندێکی تریان بە شیر و گۆشتیان، هەندێکی تریشیان بە ئێسك و پێستیان خزمەتی مرۆڤایەتی دەکەن. ئاژەڵانی لە شێوەی

مەڕ، بزن، حوشتر و مانگا گیانی خۆیان بۆ مرۆڤ بەخت دەکەن. باشە ئێمەی مرۆڤ چی بۆ ئەو خودایە دەکەین کە ئەوانی تایبەت کردووە بە خزمەتی ئێمە؟ بۆ نموونە، چەندێك لە کاتی خۆمان بۆ بەندایەتی کردن تەرخان دەکەین؟ ئەگەر هەڵبسین بە ژماردنی جۆری ئەو ئاژەڵانەی بە کەڵکی مرۆڤ دێن، تۆ بڵێی چ ژمارەیەکی گەورەمان دەست بکەوێت؟

ئەی چی بەو (مانگ)ە دەڵێن، کە ڕۆژژمێر و چرای شەوانە؟ ئەگەر هەموو شەوێك بە خزمەتمان نەگەیشتایە، چۆن لە تاریکیی نووتەکدا دەماینەوە؟ ئەو تریفە قەشەنگانەی بەهۆی تیشکدانەوەی ڕووناکیی مانگ لە دەریا و دەریاچەکاندا دروست دەبن، مانگ نەبوایە چۆن دەمانبینین؟ بیر لە وردترین ئارەزووی چاوانمان کراوەتەوە و حسێبی بۆ کراوە... ئەرێ قەت بیستووتانە مانگا بە تەماشا کردنی تریفەی مانگ، زەوق و خۆشی وەربگرێت؟



مانگا و هیچ ئاژەڵێکی تر هیچ زەوقێکی وایان نییە. گشت ئەم جوانییانە بۆ ئێمەی مرۆڤن.

باشه، ئەی خۆر لێمان زویر نابێت؟ ئەگەر هەر حسێب بۆ مانگ بکەین و خزمەتەکانی ئەو نادیدە بگرین، ئایا ناهەقیمان نەکردووە؟!
لە کاتێکدا گەلێك لە زەوییەکەی ئێمە گەورەترە، کەچی یەکێکە لە دەست لەسەر سنگترین خزمەتکارەکانی ئەو و ئێمەش کە لەسەری دەژین. هەم بە تیشکەکەی، هەمیش بە گەرمی و هەمدیس بە کاریگەرییەکانی دیکەی – کە کاریگەرییان هەیە لەسەر زیندوو ڕاگرتنی زیندەوەرانی سەری، لە ڕازاوەترین جوانییەکانی ئاسمانە...



سەرچاوەی وزەمانە... وێستگەی کارەبامانە... نە مان دەگرێت نە یاخی دەبێت... خزمەتکارێکی زۆر خاکەڕامانە... هەموو بەیانییەك، بە تیشکی ئەو ڕۆژ دەکەینەوە. وەك چۆن ناوبەناو کارەبا دەبڕێت، ئەگەر ئەویش بۆ چەند ڕۆژێك خۆی ون بکردایە، ڕووناکی و گەرمیی بۆ زەوییەکەمان نەناردایە، حاڵمان چۆن دەبوو؟

به ڕای هەندێك لە زانایان، بەهۆی ئەو تەقینەوانەی لەسەر خۆر ڕوو دەدەن، خەریکە ژیان لە هەندێك شوێنی سەر زەوی پەکی دەکەوێت...

ترسی ئەوەش لە گۆڕێدایە، بەهۆی بەرز بوونەوەیەکی کەم لە گەرمییەکەی، بەستەڵەکی جەمسەرەکانی زەوی بتوێنەوە و زەوییەکەمان ژێر ئاو بخەن...

ئێستا من لە ئێوە دەپرسم: کێیە خاوەنی ئەو هێزەی کە بەو شێوەیە خۆری خستووەتە خزمەت و ژێر فەرمانمانەوە؟

– خودای گەورە!...

– بێگومان لەژێر هێز و دەسەڵاتی خودادایە، خۆر ئەو خزمەتانەمان دەکات. ئەگەر نا، هەرچی مرۆڤی سەر ئەم ئەرزە هەیە، هەرچی زانست و هونەریان هەیە بیانخستایە گەڕ، ئەمەیان پێ دەستەبەر نەدەکرا... بۆ ئەوەی بتوانین بەگونجاوترین شێوە سوود لە تیشکی خۆر وەربگرین، بەجوانترین شێوە ڕێوشوێنی پێویست گیراوەتە بەر. چینی جۆراوجۆر چوار دەورەی زەوییان داوە تا تیشکی خۆر بەگونجاوترین و بەکەڵکترین شێوە بگات بە ئێمە. بۆ نموونە: تیشکی ڕۆژ سەرەتا دەگاتە بوارێکی موگناتیسی، دوای ئەوەی بەشە زیان بەخشەکەی لێدەگیرێت، دەگاتە چینی ئۆزۆن، دواتریش دێتە ناو ئەتمۆسفێرەوە. دوای ئەوەی تیرۆژەکان بەناو ئەم چینە یەك لەناو یەکانەدا پاڵفتە دەکرێن و خاوێن دەبنەوە، دەگەنە سەر زەوی. ئەگەر وا نەبوایە و تیشکەکانی گەردوون یەکسەر بۆمان بهاتنایە، تایبەتمەندییەکی وایان دەبوو مێشکمانیان بهەڵماندایە.

لە بەرانبەر ئەو کردگارە مەزنەی کە ئەو خزمەتکارە مەزنەی ئاوا بێ کەموکوڕیی بەکارخستووە، ئایا هیچ قەرزداری سوپاسگوزاریی نیین؟

ئایا خزمەتکارەکانمان هەر لەوانە قەتیس ماون؟ بێگومان نەخێر. ئەگەر خزمەتەکانی دایکە خاکمان فەرامۆش بکەین، ئەوا بێنمەکییەکی گەورەمان کردووە. چونکە لەو تاکە خاکە هەزار و یەك شت دەردەچێت کە سوودی بۆمان هەیە. ئەو خاکە کە ژێدەری هەموو ئەو خواردن و خواردنەوانەیە کە پێویستن بۆ بەردەوام بوونمان لە ژیان، هەم هەزار و یەك خزمەت دەکات و هەمیش بە خاکەڕاییەکی زۆرەوە هەمیشە لەژێر پێمان ڕاخراوە. وەك بڵێی دەرسی بێ فیزیمان دادەدات.

ئایا لە بەرانبەر ئەوەی کە لە ڕێی ئەو خۆراکانەی لە گڵەوە دەریاندەهێنێت و هەزاران جۆرە زیندەوەری بێهۆشی پێ بەخێودەکات و بەو جۆرە تاکە شتێك دەکات بە هەموو شتێك، سوپاسی ئەو کردگارە مەزنەمان کردووە؟ با هەر نەڵێین گڵ و بەسەریدا ڕاببوورین. ماددەی خاوی مرۆڤیش هەر گڵە. ئەوەمان لەبیر نەچێت کە لە گڵەوە هاتووین و هەر بۆ ناو ئەویش دەگەڕێینەوە.

هەندێك جار ئەو منداڵانەی مێشكیان بەكارنامێنن، دایكیان پێیان دەڵێن «مێشك دار یان بەرد». ئەمە لە كاتێكدا لە دار و بەرد چی دەردەچێت؟! وەك چۆن بەرد سەرچاوە و دایكی خاكە، ئاواش ئەو درەختانەی كە لە زستان دەبن بە دار، چ میوەگەلێكی ناوازە بەرهەم دەهێنن! هەر بۆیە ئەمانە گەلێك لەو مێشكانەی شتی بەسوودیان لێوە دەرناچێت بەنرختر ن. چ جای ئەو مێشكانەی كە بەردەوام بیری خراپیان لێوە دەردەچێت... بێگومان ئەو مێشكانە ناگەن بە مێشكی پەزیش. بۆیە با بە وتنی دار و بەرد و خۆڵ بە مێشكە زیان بەخشەكان، سووكایەتی بەو خزمەتكارە زۆر سوود بەخشانە نەكەین.



هەق وایە بۆ ئەو شتە سەنگینانەی خراونەتە خزمەت و بەرفەرمانمان زۆر لە دوور نەگەڕێین. ئەی دایك و باوك بۆ ماوەی چەند ساڵ خزمەتی ساوا تازە بووەكان ناكەن؟ ئینجا بەوپەڕی گرنگی پێدان و بێ هیچ بەرانبەرێكیش... كەس ناتوانێت بیر لە خزمەتكارییەكی ئەوەندە دڵخوازانە بكاتەوە. بەم جۆرە لەو ماوەیەدا كە تا بڵێی پێویستیی بە چاودێریی هەیە، هەر ئەوەندە دەزانێت دوو خزمەتكاری بەنرخ بە

دیار سەرییەوەن. ئەو خزمەتەی باوان بە جگەرگۆشەکەیانی دەکەن لایان خۆشترین و بەتامترین کاری دونیایە. ئایا لە ئاست ئەو خودایەی، لەو کاتەدا کە دەستمان بە هیچ ناگات، چاومان هیچ نابینێ، پێمان ڕێ ناکات، ئەو دوو خزمەتکارە بە دەورمان دێنێت و ساڵەهای ساڵ دەیانخاتە خزمەتمانەوە، هیچ ئەرکێکمان لە ئەستۆ نییە؟ ئەو دایك و باوکەی ناخۆن تا منداڵەکانیان بخۆن، ناپۆشن تا منداڵەکانیان دەپۆشن... و لە ناخی دڵەوە دەخوازن منداڵەکانیان لە خۆیان گەورەتر و پایەدارتر بن، چ کەسێکی تر بۆ کەسانی تر وا بیردەکاتەوە؟

خودا سۆز و خۆشەویستیی نەخستایەتە دڵیانەوە، دایك و باوك ئاوا بۆ منداڵەکەیان دەبوون بە شێت و دێوانە؟! خۆی هەق وایە منداڵ خزمەتکاری بۆ ئەو دوو پاڵەوانی سۆزە کە هەڵگری ئەو هەستە پیرۆزانەن بکات. ئێ خۆ ئەو خزمەتکارییەش لە ژیانی دونیادا بەسەر دەکرێت. سەرەتا دایك و باوك، دواتریش منداڵەکان ئەو ڕۆڵە وەردەگرن، بەڵام هیچ منداڵێك ناتوانێت هەقی باوانی بدات و پاداشتی ئەو خزمەتەی ئەوان بداتەوە، چونکە کاتێك دایك و باوك چاودێریی منداڵەکەیان دەکەن و گەورەی دەکەن، تاکە ئامانجیان ئەوەیە وەك مرۆڤێکی باش، ژیانێکی باشتر و درێژتر بژی. بەڵام کە منداڵ ئەو کارە دەکات، بەو قەناعەتەوە دەیکات کە ئەوان دوای ماوەیەکی تر

دەمرن و ئەو خزمەتکارییە ئەوەندە درێژە ناکێشێت. ڕاستییەکەی بیەوێت و نەیەوێت ئەوە بە خەیاڵیدا دێت.

کەواتە دایك و باوکیش دوو خزمەتکاری بێهاوتان کە خودا بە چاکەی خۆی بە مرۆڤیان دەبەخشێت. دوو خزمەتکاری بێ نموونەی وان کە پاداشتیان وەك بڵێی ئەستەمە بدرێتەوە...

ئەوەی ڕاستی بێت مرۆڤ بەر لەوەی خزمەتی دایك و باوکیش دەست پێبکات، موحتاجی چاودێری و بەخێوکرانە. تەنانەت ئەو کاتەش کە لە سکی دایکیدایە، بەجوانترین و بەسوودترین شێوە لە شوێنانێکی نەدیتراو و چاوەڕوان نەکراوەوە هەموو شتێك دەخرێتە خزمەتی. بۆ نموونە بەهۆی بۆرییەکی بەستراو بە سکییەوە بۆ چەند مانگێك وەك پارچەیەك لە دایکی خۆراکی پێدەگات. دواتریش هەر کە دێتە دونیاوە لە مەمکەکانی دایکی کە کانیی شیرن خۆراك وەردەگرێت. منداڵ کەمێك بەر لەوەی بێتە دونیاوە، ئەم خۆراکە کە نموونەی نییە، لەلایەن جەستەی دایکییەوە بۆی ئامادە دەکرێت. تێیدا جگە لەو پرۆتین و کاربۆهیدرات و کانزایانەی بۆ گەشە پێویستن، چەندین جۆرە (دژەزیندەگی)یش کە پێویستن بۆ بەرگرتن لە نەخۆشی هەیە. کێیە دروستکار و بەرهەمهێنەری ئەو خۆراکە سەرسوڕهێنەرەی دەخرێتە خزمەتی ئەو منداڵە بچکۆلانە بێ توانا هیچ نەزانە؟ شیر ئاسن و مسی تێدا نییە. ئەمە لە کاتێکدا کە ئاسن

ماددەیەکە ژیان پێوەی بەندە. چونکە لە خڕۆکە سوورەکانی خوێن دەنیشێت و ئۆکسجین بەسەر خانەکاندا دابەش دەکات. باشە ئەو پێویستییەی منداڵ لە کوێوە دەستەبەر دەبێت؟

بیر لەو پێویستییەشی کراوەتەوە و پێشتر پلانی بۆ داڕێژراوە. چونکە منداڵ هەر ئەو کاتەی لە سکی دایکیدایە، بایی ئەوەندە ئاسن لە جگەریدا هەڵگیراوە بەشی شەش مانگی دوای لەدایك بوونی بکات. بەڵێ، بەم جۆرە ئاسنیش خۆی گەیاندووەتە خزمەتمان و خۆی بۆ ئەرکە گرنگەکەی ئامادە کردووە. ئاسنی بێ مێشك و بێ فام خۆی گەیاندووەتە خزمەتمان یان گەیەنراوە؟ هیچ بونیادێ بێ بونیادنەر و کرداری بێ بکەر و گوتەی بێ گۆیا هەیە؟ مانای وایە قودرەتێکیش هەیە کە ئاسنی خستووەتە خزمەتی زارۆکەوە. ئەوسا لەبری "سوپاس بۆ تۆ جەنابی ئاسن!"، گەرەکە بیر لەوە بکەینەوە بێژین: "سوپاس بۆ ئەو زاتەی ئاسنی بۆ خزمەتی جەستەی مرۆڤ ناردووە."

***

– بەڵێ، ئێستا پێم بڵێن بزانم، من چەند خزمەتکارم هەس؟

– مامۆستا! ئەگەر لەو ڕوانگەیەوە بڕوانین، دەتوانین بڵێین: هەزاران و بگرە ملیۆنان خزمەتکارمان هەیە.

– بێگومان دەبێت لەو ڕوانگەیەوە بڕوانین. چونکە ئەم ڕوانگەیە ڕوانگەی ڕاستی و زانستییە. خودا لە ڕێی ئەو هەموو خزمەتکارەوە

ئاسوودەیی و کامەرانیی بۆ دەستەبەر کردووین... باشە مرۆڤ کە خاوەن ئەو سەڵتەنەتە سەراسیمەیەیە و باڵاترین بوونەوەرە، لەسەریەتی خزمەت بە کێ بکات؟ مرۆڤ کە ئەو هەموو بوونەوەرە خراوەتە ژێر فەرمانییەوە، دەبێت لەژێر فەرمانی کێدا بێت؟ ئایا ئەو مرۆیە، ئەرکێکی بەندایەتیی لەسەر نییە کە گەلێك لە هی ڕووەك و ئاژەڵان زیاتر و گەورەتر بێت؟ هەر بەڕاستی مرۆڤ سەرداری بوونەوەرانە، وەلێ ئەگەر هەست بەو پایە بڵندی و ئەو نرخە نەکات کە پێی دراوە و لەبەر چاویان نەگرێت، ئەوا بە دەستی خۆی، خۆی لەو لوتکەیەوە کە لەسەریەتی، هەڵداوەتە ناو کەندەڵانەوە. یەکەم مەرجی ئەو نەکەوتنە کەندەڵانەش باوەڕە، ناسینی ئافەرید و گوێڕایەڵی کردنییەتی، چونکە "ئیمانە ئینسان دەکات بە ئینسان. نەك هەر ئەوەندە، دەشیکات بە سوڵتان."



## هەمووومان ملیاردێرین

دوێنێ هاورێیەکم هاتە لام، گیرۆدەی کێشە و گرفت بوو. زۆر ئاخ و داخی هەڵدەکێشا.. پێدەچوو بە دەست بێ پارەییەوە بناڵێنێت. وتم:

– عەیبە بۆ تۆ. خۆ تۆ ملیاردێریت. ئینجا لەم دونیایە بێزاریت و بەبەلاش سەرئێشە بۆ خۆت دروست دەکەیت.

هەڵبەت سەری سورما. وتم:

– سەیر بکە. ئەگەر قۆڵەکانت بە دوو ملیار بقەڵسێنن، بێن و لە سینگتەوە لێی بکەنەوە و بیبەن، پێیان دەفرۆشیت؟

– نەوەڵڵا، نایفرۆشم.

– ئەی چاوەکانت بە ملیارێک دەدەیت؟

– نەخێر، نایدەم.

– هەر دوو قاچت بە پێنج سەد ملیۆن؟

– نەخێر، نایاندەم.

– ئەی کەواتە بەو هەموو سەرمایەیەوە، ئەوە ڕاستە ئاخ و داخ هەڵبکێشیت؟ کورت هێنانێکی کەمی پارە، بە سەر هەموو کەسێکدا دێت. واز لەو کارە سەیرانە بێنە.

خەڵکی لەجیاتی ئەوەی بە بینینی گوڵێک لەنێو دڕکەڵاندا دڵخۆش بن، بە بینینی دڕکێک لەنێو گوڵاندا گلەییان لێ بەرز دەبێتەوە.

هەموو مەسەلەکە لەناوبردنی ئەو مەنتیقە چەوتەیە. ئەوەی نەتوانێت ئەمە بکات، خاوەنی ملیاران و بگرە تریلیۆنانیش بێت، مەحاڵە دڵخۆش ببێت.

**گوریوز ئەزاک**

(نامە بۆ دۆستان، ل٧٣، ١٩٨٠)

## دیسان تەم

کە ئەو بەیانییە لە خەو هەڵساین، چاو چاوی نەدەدی. تەمێکی چڕ هەموو لایەکی داپۆشیبوو. بەزەحمەت توانیم بگەمە قوتابخانە. ئەگەرچی (غیابات) وەرگرتنم دە دەقەیەك دواخست، کەچی هێشتا دە قوتابی نەهاتبوون.

وتم:

– ئەوان لە کوێن؟

چاودێری پۆل وتی:

– لەبەر تەمەکە نەهاتوون. ئێمەش زۆر بەزەحمەت توانیمان بێین. ئەو هاوڕێیانەمان لە دوورەوە دێن. کەمێك تەمەکە کاڵ ببێتەوە، ئەوانیش دێن...

بەڵام ئەو ڕۆژە تا ئێوارەش تەمەکە هەر ما. دەچوومە هەر پۆلێکەوە، بە لایەنی کەم پێنج قوتابی نەهاتبوون. بە قوتابییەکانم وت:

– ئەگەر هەموو ڕۆژێك لە ئەستەنبووڵ تەم بوایە، حاڵمان چۆن دەبوو؟

بێگومان ڕای هەموویان وەك یەك بوو و پێکهاتبوو لە یەك ڕستە "ژیان پەکی دەکەوت". هەر بەڕاستیش لە ڕۆژنامەکاندا ئەوە نووسرابوو کە لە ئەنجامی ئەو ڕووداوانەی ئۆتۆمبێل کە بەهۆی تەمەکەوە ڕوویان دابوو، چەندین کەس گیانیان لەدەست دابوو.

دوای هەفتەیەك، کە تەمەکە نەما، هەموو کەس کەیفی هاتەوە جێی خۆی. هەموو کەسێك لەبەرخۆیەوە دەیوت: "ئۆخەی، دەرکەوت دونیا هەیە!"

لە پۆلەکەم پرسی:

– ئەریّ ئەم ڕۆژە تەماوییانە، تا هەفتەیەکی تر بەردەوام بیّ، دیسان دێنەوە؟

هەموو وتیان:

– نەخێر.

– باشە، بلیت و کرێی ئەوەی کە هەموو ڕۆژێك بەڕۆشنی دەکەینەوە، چییە؟ کێیە ئەوەی ڕۆژگارمان ڕووناك دەکاتەوە؟

– مامۆستا گیان! خودا ڕووناکیان دەکاتەوە.

– باشە، ئەوەی هەموو ڕۆژێك بەڕوونی دەبەینەسەر، بێبەرانبەرە؟ ئایا بەهۆی ئەوەوە، لە بەرانبەر خودای گەورەدا ئەرك و قەرزێکمان لەسەر نییە؟

– لەسەرمانە شوکرانەی بکەین.

- لەسەرمانە بەندایەتیی بۆ بنوێنین.
- نابێت پەرستشەکانمان فەرامۆش بکەین.

بەڵێ، بەو جۆرە تەمەکە تەمومژێ سەر مێشك و ناخی لابردبووین. بە پۆلەکەم وت کە پێویستە لە کانگای دڵەوە ئاوا نزاکۆ بین بەرانبەر بە خودا:

"پەروەردگارا! با ڕۆژگارمان تەماوی و تاریك نەبێت، با هەر ڕوون و چراخان بێت. وەك چۆن هەتاو ڕۆژەکانمان ڕووناك دەکاتەوە، با ئاواش خۆشەویستیت دڵەکانمان نوورانیی بکات. وەك چۆن لە دونیادا هەتاوت پێبەخشیوین، لە ژیانی نێو گۆڕیشدا ڕووناکییە مەعنەوییەکانتمان لێمەشارەوە. خودایە نوورمان پێببەخشە، نوور... بۆ ئەو ڕووناکییانەی تا ئێستا پێت داوین و ئەوەش کە لەمەودوا پێمانی دەدەیت شوکرانەبژێریت دەکەین..."



## پێڵاوەکەی عوسمان

## و هەستی یارمەتیدانی یەکتر

ڕۆژێکی سارد و بەفرانباری زستان بوو. کە بەیانییەکەی چوومە یەکەم وانەوە، نزیک بە نیوەی پۆل هێشتا نەهاتبوو. ناوبەناو یەکێکیان بە ژوور دەکەوت. گۆنای گشتیان سوور سوور هەڵگەڕابوو. وەک بڵێی لەبەر سەرما سووتابوون! بۆیە بە دێر کەوتوو ئەژمارم نەکردن. بەڵام عوسمان کە هات وانەکە نیوە زیاتری لێ ڕۆیشتبوو. وتم:

- تۆ تا ئێستا ئەوەندە دوا نەدەکەوتیت. دەزانم ئێستا باسی بەفر و شەختە دەکەیت. بەڵام سەیرکە، هاوڕێکانت دەمێکە هاتوون.

عوسمان کەوتە گریان. ئەوەندەی پێنەچوو وەرینی ئەسرینەکانی بۆ سەر کوڵمە ئاڵ هەڵگەڕاوەکانی دەستی پێکرد...

- باشە، دابنیشە. خۆت دڵتەنگ مەکە. هەوڵ بدە جارێکی تر ئەوەندە دوا نەکەویت، باشە؟

عوسمان لە بەرانبەر ئەم قسانەمدا هەر ئەوەندەی پێکرا بە سەربادان بڵێت: "بەسەر چاو" و دانیشت. لە کۆتایی وانەکەدا، بانگی چاودێری پۆلم کرد و داوام لێکرد هەوڵ بدات بزانێ عوسمان بۆ ئاوا بەئاسانی دڵتەنگ بوو و کەوتە گریە. (شوعلە)ی چاودێر، کچێکی ژیر و تێگەیشتوو بوو، وتی: "من دەزانم بۆ. ئەگەر حەز دەکەی پێتی دەڵێم." وتم: "نا، باش لێی بکۆڵەوە و هەوڵ بدە بەتەواوی بیزانی، دواتر قسەی لێدەکەین."

دوو وانە دواتر، ئەوەی شوعلە بۆی باس کردم، زۆر کاری تێکردم. چونکە شوعلە باسی لەوە کرد کە کالە پەڕۆینەکەی عوسمان، وەك کارێز ئاو دەمژن و هەر بۆیەش هەموو ڕۆژێك کە دێتە دەوام، لەسەر سۆبای دالانەکە، وشکیان دەکاتەوە. ئەو ڕۆژەش کە دێر کەوتبوو، لەبەرئەوە بوو کە زۆری پێچووبوو تا وشکی کردبوونەوە. ئەو پێیانەی کە بەدرێژایی زستان دەتەزن، وایان لێهاتووە لە کەش و

هەوای ناساردیش، هەر ئازاریان هەیە. تەنانەت جارێکیان پزیشك پێی وتووە باداریی هەیە.

ئەوانــەی شــوعلە وتنــی زۆر دڵتــەنگیان کــردم. بــە چــوار چــاو چاوەڕوانی هــاتنی وانــەی دواتــر بــووم لــەو پۆلــە. بــەڵام کــە چوومە پۆلەکەوە، دڵتەنگییەکەم چەند قات زیادی کرد. چونکە عوسمان ئـەو ڕۆژە نەیتوانیبوو بێتە دەوام. دووەم ڕۆژیشــی بــوو نەیــەت. لــە هــۆی نەهاتنیم پرسی. شوعلە وتی کە وا نەخۆشە. قوتابییــەکی دیکــەم کــە هاوســێیان بــوو ئــەوەی گێڕایــەوە کــە بــاوکی عوسمــان، دوو ســاڵ لەمەوبەر بە کارەساتی ئۆتۆمبێل گیـانی لەدەسـت داوە، دایکیـان بـە بەرگدروویی ئەو ماڵە دەبـات بـەڕێوە. تێکـڕای پـۆل، پێکـڕا ئـاڵابووە بێدەنگییەکی هەستەوەرانەوە. پێم وتن:

– ڕۆڵە شیرینەکانم! کێ بەوە دڵتـەنگ نییـە کـە ئـەمڕۆ عوسمـان لەنێوماندا نییـە، بـا دەسـتی بـەرز بکاتـەوە. کەسـێکی وا هەیـە لـەم پۆلەدا؟

هەڵبەتە دەستی کەس بەرز نـەبووەوە. هـەر خـۆم بێدەنگییەکـەم تێکدا:

– بەپێی ئەوەی دەیبینم، هەمووتان بـۆی دڵتـەنگن. بێگومـان لـە بەرانبەر ڕووداوێکی دڵ تەنگکەردایـن. بەڵام ئایا لە بارێکی وادا، تـەنها دڵتەنگ بوون بەسە؟ یان شتی تریش هەیە، پێویستە بکرێت؟

گشت پۆلەکە لە پەشیمانیدا بوو. زۆریەیان، وێڕای ئەوەی بەو بارودۆخەی عوسمانیان زانیبوو، لەبەر ئەوەی نەکەوتبوونە کار بۆ بەدەمەوە هاتنی، لۆمەی خۆیان دەکرد. هەندێکیشیان، ئەگەرچی دەیانوت: "ئێمە نەماندەزانی حاڵی وایە"، بەڵام شوعلە یەکسەر بێدەنگی کردن. وتی:



- هاوڕێینە! چۆن بە حاڵیتان نەزانیوە؟ ئەو کاڵە شڕ و دڕاوانەی پێیتان نەبینیوە کە لەکەیەکەوە لە پێین؟...

پۆل دیسانەوە کەوتەوە بێدەنگییەکی خەمبارانەوە. پێم وتن:

- ئێستا، ئیی دی واز لە ڕابردوو بێنن... لەمەودوا دەتوانین چی بکەین؟ با بیر لەوە بکەینەوە.

هێشتا من قسەکانم تەواو نەکردبوو، دەستپێشخەریی بەدەمەوە چوونی دڵ خۆشکەر داباریین.

- ئێمە، ئەم پێنج هاوڕێیە، پێڵاوێك بۆ عوسمان دەکڕین.

- با یارمەتیی بۆ کۆ بکەینەوە.

- من دە هەزار لیرە دەبەخشم.

– با عوسمان ببەین بۆ چارەسەری...

– من دایکم دەرمانسازە، دەرمانەکانی بۆ دێنم...

– پێش ئەوە، با بیبەین بۆ لای دکتۆر...

– ڕوخسەت هەیە، ئێمە مەسەلەی بردنە دکتۆرەکەی لە ئەستۆ بگرین؟

من وەك ئەوەی لە پۆلێکی هەشتی بنەڕەتیدا نەبم، بەڵکو لە کۆبوونەوەیەکی فریشتەییانەی فریشتەکاندا بم... تەنانەت لەو قوتابییانەی لێم ڕانەدەدیتن، چ دەستپێشخەریگەلی لەخۆبردووانە دەهاتن! ئەی خودایە! خەڵکی ئێمە، لاوی ئێمە چەند باشن! هەستی بەدەمەوە چوون لای گەنجی ئێمە چەند زۆرە... بەڕاستی سەرم سوڕمابوو، وەلێ دڵخۆشییەکەم زیاتر بوو...

کاتێکیش دواتر هەموو ئەوانەم بۆ بەڕێوەبەری قوتابخانە گێڕایەوە، زۆر کاریان لەویش کرد و دەمودەست کەوتە بەهەند وەرگرتنی. لە ڕێی (ڕێکخراوی پاراستنی قوتابخانە)وە، سەرجەم پێویستییەکانی عوسمان دەستەبەرکران. بەو پارەیەی لە پۆلیشدا کۆکرایەوە، قاتێك تراکسۆت و کالەی بۆ کڕا. کاتێك لە وانەی «خووڕەوشت»دا، شوعلە بە ناوی پۆلەوە دانی پێی، هەم عوسمان و هەمیش تێکڕای پۆل، بە هەنسکەوە کەوتنە گریان. قەت ئەو پۆلەم ئاوا بە دڵخۆشیی نەبینیبوو. ئەو پۆلە و پۆلەکانی تریش... چەند

سەیر و ناوازەن، وا نییە؟! هەندێك جار مرۆڤ، بە ئەسرینەکانی گوزارشت لە دڵخۆشیی خۆی دەکات... ئەگەرچی عوسمان بەزەحمەت دیارییەکانی قبووڵ کرد، بەڵام پێم وایە ئەویش لەو ساتانەدا خۆشترین ساتەکانی ژیانی دەگوزەراند...

منیش سوپاسی پۆلەکەم کرد و وتم: "رۆڵەکانم! ئەم هەڵسوکەوتە جوانەتان بوو بە بەجێ هێنان و سەلماندنێکی جوانی برایەتیی ئاینی." ئیتر لەو رۆژە بە دواوە، هەر کاتێك لە پۆلەکانی تردا باسی یارمەتی، خێر و چاکە کردنم بکردایە، ئەوانم بە نموونە دەهێنایەوە.

دوای بیست رۆژێك، ئەو هەواڵەی لە پۆلێکی ترەوە پێم گەیشت، ئەوەی پیشان دەدا کە ئەو نموونەیە بە دڵی زۆر کەس بووە. عەلیی چاودێری پۆل هاتە لام و پێی وتم:

- مامۆستا! ئەو رووداوەی ئەو پۆلە، زۆر کاری تێکردین. یەکسەر گرووپێکی بەدواداچوونی سێ کەسیمان پێکهێنا... بۆمان دەرکەوت سێ قوتابی پۆلەکەمان، پێویستییان بە یارمەتیدانە. پارە و کەلوپەلمان بۆ کۆکردنەوە و پێمان دان. بەو هۆیەوە پەیوەندیی دۆستانەمان گەلێك بەهێز بوو و وەك یەك خێزانمان لێهاتووە. ئێستا هەمووان یەکترییان زیاتر خۆش دەوێت.

کاتێك كە ئەو نموونە جوانانە لە زۆر بووندا بوون، دەرسمان گەیشتە زەکات. ئەمە هەلێكی باش بوو. چونكە زەكات ڕۆڵێكی بنەڕەتیی هەیە لە ژیاندنەوەی هەستی بەدەمەوە چوونی یەكدی.





## زەکات و سوودەکانی

زەکات وشەیەکی عارەبییە، لە ڕووی زمانەوانییەوە پاکژی دەگەیەنێت. ئەم پەرستشە ڕۆح و دڵی مرۆڤ پاک دەکاتەوە. ئەمە جگە لەوەی کە ئەوماڵەی زەکاتی لێدەدرێت، پاک دەبێتەوە. زەکات کە ئەوە دەگەیەنێت موسڵمانی دارا ساڵی جارێک چل یەکی ئەو قازانجەی بەدەستی هێناوە بیدات بە نەداران، یەکێکە لە پێنج پایەکەی ئیسلام. کەواتە ئەگەر زەکات -کە یەکێکە لە فەرمانە حەتمییەکانی خودا- نەدرێت، ئەوا ئەو سامان یان پارە و پووڵە پیس و پۆخڵ بووە...

وەك گشت فەرمانەكانی دیكەی خودا، زەكاتیش چەندین سوودی بۆ تاك و كۆمەڵ هەیە. هەڵبەتە ئەو موسڵمانەی زەكات دەدات، بەر لە هەر شتێك، دەیەوێت یەكێك لە پایەكانی ئیسلامەتی بێنێتە جێ، ئەم پەرستشەش وەك گشت پەرستشەكانی تر، تەنها و تەنها بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندیی خودا ئەنجام دەدات. بەڵام بەجێ هێنرانی ئەم فەرمانە خوداییە، سوودگەلێكی بێشوماری بۆ ژیانی ئێمەومانان هەیە.

ئێستا، بەر لەوەی بەكورتی باسی ئەو سوودە بێشومارانە بكەین كە زەكات بەدەستمانی دەخات، با ئەوەش بزانین، گشت تاكەكانی جڤاك سوود لە زەكات وەردەگرن. واتە زەكات پەرستشێكی وایە، كە سوودی بەس بۆ ئەوەی دەیدا و ئەوەی وەریدەگرێت قەتیس نامێنێت. ئەوەی لەو جڤاكە دەژی، سوودی ئەو زەكات دانەی بەردەكەوێت. ئێستا با بەكورتی چاوێك بە سوودەكانی زەكاتدا بگێڕین:

**ئەو موسڵمانەی زەكات دەدات:**

**١- لە دونیاپەرستی و ئەو ماددەگەرییەی دڵی مرۆڤ ڕەق دەكات و هەڵسەنگاندنی هەموو شتێك بە پارە و پووڵ، ڕزگاری دەبێت. چونكە بۆ ئەوەی بتوانێت ئەو پارەیەی خۆی بە دەستی هێناوە بێ**

بەرانبەر بدات بە کەسانی دی، پێویستیی بەوەیە خەڵکی خۆش بوێت و سکی بە هەژاران بسووتێت و فەرمانی خودای لەبیربێت.

٢- زەکات ئەو کەسە لە ڕژدیی ڕزگار دەکات و لە بەخشندەیی ڕایدەهێنێت. ئەو چەقی بەدکارییەی کە لە ناخماندایە و پێی دەوترێت نەفس، هەمیشە فەرمانی نەبەخشین بە مرۆڤ دەدات. ئەم هەستە کە حەز دەکات تەنها و تەنها خۆمان سوود لەو نیعمەتانە وەربگرین کە هاین تێیاندا،



دەتوانین بە زەکات دان بەسەریدا زاڵ ببین. بەو جۆرە ویستی «نەبەخشین»ی نێو ناخمان بەهۆی هێزی ئیرادەوە دەگۆڕێت بۆ «بەخشین». ڕژدیی خووێکە خودا خۆشیی لێنایەت. باشترین چارەسەری ئەم خووە - کە خۆشەویستیی و بەدەمەوەچوونی نێوان مرۆڤەکان لەناو دەبات و ڕق و ئێرەیی دروست دەکات، زەکاتە. چونکە زەکات مرۆڤ ناچار بە بەخشین دەکات، ئەو کاتیش بیەوێ و نەیەوێ بەخشندە دەردەچێت. کەسێك ڕابێت لەسەر ئەوەی هەموو

ساڵێك یەك لە چڵی قازانجەكانی ببەخشێتەوە، ڕێی تێدەچێت بە ڕژدیی بمێنێتەوە؟!

**٣- خودای گەورە لەم گەردوونەی دروستی كردووە، هاوسەنگییەكی ڕاگرتووە. گشت بوونەوەرێك لە لایەكەوە وەردەگرێت و لە لاكەی ترەوە دەبەخشێت. ئەوەی هەر وەربگرێت و هیچ نەبەخشێت، ئەوا ڕاسپاردەكەی بەجێ نەهێناوە و ناپاكیی كردووە.**

چونكە هەموو ئەوەی لەم دونیایەدا هەمانە، ئەمانەتگەلێكن بە ئێمە دراون، بەدڵنیاییەوە ڕۆژێك لە دەستمان دەردەچن، لەگەڵ ئەوەشدا لەسەریان لێپرسینەوەمان لەگەڵدا دەكرێت. لەم گۆشەنیگاوە، ئەوە ڕاست نییە كەسێك بێژێت: "خودای من! بەس بدە من". پێغەمبەریشمان (دروودی خودای لێ بێت) فەرموویەتی: **"ئەو دەستەی دەبەخشێت لەو دەستەی وەردەگرێت بەرزترە"**. بۆیە پێویستە ئەو شتانەی خودا زیاد لە پێویستیی خۆمان بەنسیبی كردووین، ئێمەش بیدەین بە كەسانی تر و بەو جۆرە ئەوە پیشان بدەین كە خاوەن كەسایەتییەكی كاملین. **ئەوەی هەمیشە وەردەگرێت و هەرگیز نابەخشێت، ئەوا لە ڕووی ڕۆحییەوە نەخۆشە.**

**خودای گەورە لەم گەردوونەدا یاسایەكی داناوە:**

**«گشت ئافەریدەیەك دەبێت بایی ئەوەندەی پێویستیەتی وەربگرێت و بایی ئەوەندەی كەسانی تر پێویستیانە، پێیان**

ببەخشێت.» بۆ نموونە: با بیر لە درەختێك بکەینەوە: ئەوەی پێی دەدرێت تەنها ئاوێکی قوڕاوییە. وەلێ ئەو درەختە لە بەرانبەر ئەو قوڕاوە دێت و گەڵا و گوڵی ڕەنگاوڕەنگ دەردەهێنێت و بە کیلۆ میوە بەرهەم دێنێت، دار دەبەخشێت، تەنانەت دوای ماوەیەك تەواوی بوونی خۆی بۆ ئادەمزاد فیدا دەکات. خۆ ئەگەر هەموو ئەمانە نەبەخشێت، هیچ گرنگی و مانایەك بۆ بوونی نامێنێتەوە.

با بیر لە مەڕێك بکەینەوە: لە بەرانبەر ئەو چنگە گیا یان کا و جۆیەی دەیخوات، چەند ساڵێك شیری بەتام و خوریی نازداریمان پێدەبەخشێت. کە کاتی دێت، تەنانەت گۆشتەکەشی دەبەخشێت و تەواوی بوونی خۆی بۆ مرۆڤ دەکات بە قوربانی.

بێگومان هەر درەخت و مەڕ وا نین، گشت بوونەوەران لە بارێکدان کە بۆ ژیانیان شتانێك وەردەگرن و بۆ ژیانی زیندەوەرانی تریش شتانێك دەبەخشن. ژیان لەسەر هاوسەنگییەکی پێ دان و وەرگرتن بنیات نراوە. وەك چۆن پێ دانی بێ وەرگرتن تایبەتە بە خالق، ئاواش ئەوەی لەوەی دەیسێنێت هیچ نادات بە هیچ کەسێك، یاخییە لە یاساکانی خەلق. وەرگرتن مافمانە، وەلێ پێ دانیش ئەرکمانە. ئەو موسڵمانانەی خودا دەوڵەمەندیی کردووە بە قسمەتیان، ئەو زەکاتەی داوایان لێکراوە بیدەن بەو هەژارانەی کە هەقی خۆیانە، ئەگەر بێت و ئەو فەرمانە پێشێل بکرێت، کەسایەتیی ئەو دەوڵەمەندە گەشە

ناکـات، بـەردەوام بـەهۆی ئـەو هەسـتی تاوانبارییـەی لـە ناخیـدا هەڵیدەگرێت، ئازاری ویژدان دەچێژێت و لەلایـەن کەسـانی تریشـەوە خۆشەویست نابێت و حسێبی بۆ ناکرێت.

٤- ئـەو کەسـانەی زەکاتـەکانیان دەبەخشـن، لـە خێرکـردن و یارمەتیدان ڕادێن. بەهۆی چەشتنی ئەو خۆشییەی ئەو جۆرە کارانـە بە مرۆڤـی دەبەخشن، هەر بە زەکاتدان ناوەستن، بەڵکو بەدەم کاری یارمەتیدانی تریشەوە دەچن.

٥- پەرستشـی زەکـات، سوپاسـگوزارییەکە لـە بەرانبـەر ئـەو دەوڵەمەندییەی خودای گـەورە داویـەتی. شـوکرانەی مـاڵ و پـارە و سامان، تەنها بەوە دەبێـت کـە ئـەو بەشـەی لەناویـدا مـافی هەژارانـە پێیان بدرێت. چونکە شوکرانەی دەوڵەمەندیی هەر بە زمان ناکرێت.

٦- زەکات ئەوە بەبیر کەسەکە دێنێتەوە کە خاوەنی ئەسڵیی ئەو سـامانە خـودای گەورەیـە. ئـەوەی بـەبیردا دێنێـت کـە ئـەو تـەنها ئەمانەتدارە لەسەری. ئەوەی بیر دەخاتەوە کە دونیا و هەرچییەکیش لەسـەری هەیـە، دێـت و دەڕوات و ڕۆژێـک هـەر لـەژێر دەسـتی دەردەهێنرێت. چونکە دەوڵەمەندیی ئەنجامی ژیریی و ڕەنجدانی زۆر نییە. زۆر کەسی ژیر هەیە و زۆریش هـەوڵ دەدەن، بـەڵام دەوڵەمەنـد نابن. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە دەشێ دەوڵەمەنـدیی لـە ئـەنجامی ژیریی و کارکردنی بە پلان بەدەست بێ، بەڵام بەر لە هەر شتێك بەوە

بەدەست دێت کە بڕیاری خودای لەسەر بێت. کە بە بڕیاری ئەو بێت، ئایا پێویست ناکات لەسەر فەرمانی ئەویش بدرێت بە هەژاران؟

**٧- ئەو کەسەی زەکات دەدات، دونیای ناوەوەی ڕۆشن دەبێتەوە و شادی و ئاسوودەیی ناخی زیاد دەکات.** یارمەتیدانی کەسێک تەنها و تەنها لە پێناوی خودا و بێ چاوەڕوانی کردنی هیچ شتێک لە کەسەکە، یەکێکە لە گەورەترین هەستەکانی دونیا. ئەگەر ئاسوودەیی ئەوەشی کە فەرمانی خودا بەجێهێنراوە بخرێتە سەری، ئەوپەڕی شادیی دێتە ئاراوە. هەر لەم ڕوانگەیەوە، ئەوەی برسییەک تێر دەکات، سەرەتا خۆی تێر دەکات. ئەوەی ڕووتێک پۆشتە دەکات، ئەوا سەرەتا خۆی پۆشتە کردووە. تەنانەت ئەو کەسەی یارمەتییەکەی داوە زیاتر لە ناخی دڵییەوە هەست بە خرۆشانێکی بەچێژ دەکات لەو هەژارەی تێر و پۆشتە و پەرداخ بووە. ئا بۆ گەیشتن بەو شادییە ڕاستی و باقییە، زۆرێک لە کەسە داراکان، بەوپەڕی دڵسۆزییەوە لە دەزگا خێرخوازییەکان ئەرك دەگرنە ئەستۆ و بگرە وەقف دادەمەزرێنن.



**٨- زەکات مرۆڤ لە تەنگژە ڕۆحی و دڵییەکان ڕزگار دەکات.** چونکە ئەو کەسەی زەکات دەدات، لە ڕێی ئەو خۆشی و ئاسوودەییەی لە دونیای ناوەوەیدا

هەستی پێدەکات، ڕزگاری دەبێت لەو فشار و ناڕەحەتییانەی کاروبارەکانی ژیان دروستی دەکەن. قورسترین دڵتەنگی و گرێ کوێرەکان بە بزەی هەزارێکی دڵسووتاو دەکرێنەوە و نامێنن... خودای گەورە کرێی هەموو چاکە کردنێکی لەناو ئەو کارە چاکەدا وەك پێشینەیەك داناوە.

لە هەندێك لە وڵاتە ئەوروپاییەکاندا، پسپۆڕان بۆ ئەو کەسانەی بەهۆی زیاد کەوتنە دوای کارە ماددییەکانەوە تووشی کێشە و گرفت هاتوون، وەك شێوازێکی نوێی چارە کردن، ئامۆژگارییان دەکەن یارمەتیی ماددیی کەسانی تر بدەن.

ئەوانەی ئەوەندە خۆپەرست و قرچۆکن کە هیچ شتێك لەوەی بەدەستی دەهێنن نابەخشن بە هیچ کەسێك، ئەو کەسە دەمارگرژ و دڵ پڕ لە دڵەڕاوکێیانەن کە بەردەوام لە خەمی ئەوەدان قازانجی زیاتر بەدەست بهێنن. ئەم نەوعانە، لەبەر ئەوەی هەمیشە لە حاڵێکی خراپی دەمارگرژیدان، تەندروستییشیان زوو تێکدەچێت. هیچ کەسێك و بەتایبەت هەژارەکان ئەم جۆرە مرۆڤانەیان خۆش ناوێ و تەنانەت هەندێکیان دەکەونە دوژمنایەتیشیان. کەواتە ئەوانەی دونیا لایان بەس گوزارشتە لە ماددە، ئاسایشی گیان و سامانیشیان هەمیشە لە مەترسیدایە. ئەم جۆرە زەنگینانە، لە ڕوویێکەوە بۆیان بڕوانی، زیندانیی دەستی سامانەکانیانن. ماڵ و پارە و قازانج، ئاراستەیان

دەکەن و بەدوای خۆیانیان دەخەن. ئەمە لە کاتێکدایە کە ئەوانەی کەسانی تریش لە زەنگینییەکەیان سوودمەند دەکەن، ئەوا سامانەکانیان بەند کردووە و خستوویاننەتە خزمەت و ژێر فەرمانی خۆیانەوە. ئەوەی وا لە دونیا گەیشتووە، ئەوا لەوە گەیشتووە ئەم دونیایە کاتییە، دێت و دەڕوا و شوێنی تاقیکردنەوەیە. بەم جۆرەش لەوە ڕزگاری دەبێت دڵی بە دونیا و ماڵ و سامانەوە بەند ببێ.

٩- زەکات سامانی فانیی مرۆڤ دەکات بە باقی و ئەبەدی. ماڵ و سامانی بێ نرخ، نرخ پەیدا دەکات، یان نرخی لە نرخی خۆی زیاتر بەدەست دەهێنێت، چونکە ئەو پارەیەی لە یارمەتیدان و کاری خێر و چاکە دەڕوات، ئەوا لە پێناوی خودادا سەرف کراوە.

بەم جۆرە ماڵ و سامانی فانیی کە خاوەن بەهایەکی دیارە، وەردەچەرخێتە سەر خێرێکی وا کە ژیانێکی کامەرانیی نەبڕاوە لە بەهەشتی ئەبەدیدا دەستەبەر بکات.

وەك چۆن ئەو تۆوە وردەی دەیخەینە ژێر گڵ دەبێتە درەختێکی گەورە و هەزاران هێندەی خۆی گەورە دەبێت، ئەو ماڵ و سامانەی دەدرێتە خودا و لەپێناو ڕەزامەندیی ئەودا خەرج دەکرێت، ئاوا گەورە دەبێت و نرخ پەیدا دەکات... ڕێی پێ دانی ماڵ و سامانیش بە خودا، بە زەکاتدا تێدەپەڕێت.

١٠- ئەو سامانەی دەدرێتە خودا، لە دونیاشدا بەرەکەتی زیاد دەبێت. ئەگەر نا، ئەوا لە جێی خۆیدا سەرف نەکراوە و بەوەش لە دەست دەردەچێت و لە کورتیی دەدات.

١١- زەکات نیشانەیەکی گرنگی وابەستەیی مرۆڤ بە خودا و تەسلیم بوونە پێی. چونکە ئەوەی زەکات دەدات ئەوا ملی بۆ داد و فەرمانی خودا کەچکردووە و خووی دانی هەق بە خاوەنەکەی بەدەست هێناوە. باوەڕی مرۆڤی لەو جۆرە بەهێز دەبێت.

## زەکات بۆ ئەو هەژارانەی وەریشی دەگرن، سوودی هەیە:

١- زەکات، نەداران لە ئاتاجییە زۆر پێویستەکانیان ڕزگار دەکات. بەم جۆرە ئەوانەی لە ڕووی ماددییەوە لە بارێکی دژواردان، ئەوانەی لەژێر موحتاجی و قەرزداری ناڵەیانە، دەگەن بە ئاسوودەیی و کامەرانیی.

٢- زەکات هەستی ئێرەیی پێبردن و تەنانەت دوژمنایەتی کردنی دەوڵەمەندان لای هەژاران لادەبات. بەهۆی ئەو یارمەتییانەی تەنها و تەنها لە پێناوی زاتی خودادا پێیان دەدرێت و چاوەڕێی هیچ پاداشتێکیان لێ ناکرێت، دڵیان نەرم دەبێت و پڕ دەبێت لە خۆشەویستیی.

**٣- هەژاران دەبنە مایەی ئەوەی موسڵمانە دەوڵەمەندەکان خێری زەکاتیان بەربکەوێت. چونکە ئەگەر لە جڤاکدا هیچ هەژارێك نەبوایە، دەوڵەمەندەکان چۆن پاداشتی زەکاتیان دەست دەکەوت؟ بەم بۆچوونەوە ئەو هەژارەی زەکاتەکە وەردەگرێت بە بیرکردنەوە لەوەی کە دەوڵەمەندەکەی لە قەرزداریی مەعنەویی ڕزگار کردووە، سووك نابێت، بەڵکو بەپێچەوانەوە پایەیەکی ڕێزلێگیراو لەنێو جڤاکدا بەدەست دەهێنێت. لەم گۆشەنیگایەوەیە پیاوێکی گەورەی ئیسلام فەرموویەتی:**

**"ئەگەر ئەو دەستەی وەردەگرێت ماچ بکەین، جێی خۆیەتی. چونکە لە چارەی ئەوانە خێری زەکات و سەدەقە بەدەست دەهێنین..."**



## سووده کۆمەڵایەتییەکانی زەکات:

١- زەکات هاوسەنگییەکی ئابووری لە کۆمەڵگەدا دێنێتە ئاراوە. بەوەی وا لە دەوڵەمەند دەکات بەشێکی سامانەکەی بە هەژاران ببەخشێت، ئەو جیاوازییە دارایییەی لەنێوانیاندا هەیە، لە ئاستێکی دیاردا ڕادەگرێت. دەوڵەمەند زۆر دەوڵەمەند و هەژاریش زۆر هەژار نابێت.

٢- زەکات بیمەیەکی کۆمەڵایەتییە، کە بەتایبەت بە هانای هەژار و نەدار و قەرزدار و بێدەرەتانانی جڤاکەوە دەچێت. ئەم بیمە کۆمەڵایەتییە کە ئیسلام بەر لە ١٤٠٠ ساڵ دایمەزراندووە، وڵاتە مەسیحییەکان لە ساڵی ١٩٤١ ئینجا توانیویانە دایبمەزرێنن. لە ڕێککەوتننامەی (ئەتڵەنتیک)ی نێوان ئەمریکا و ئینگلتەرادا، بۆ یەکەم جار بڕیار لەسەر دامەزراندنی دەزگای بیمەی کۆمەڵایەتی بۆ تاکەکان دراوە.

٣- زەکات پشتیوانییەکی گەورەیە بۆ هەڵمەتی هەڵسانەوەی کۆمەڵگە لە ڕووی ئابوورییەوە. چونکە بەر لەوە دەگرێت پارە ستۆک بکرێت و لە کونج و کەلەبەردا بشاررێتەوە و، بەرەو وەبەرهێنان ئاڕاستەی دەکات. ئەگەر نا، ئەو پارەیە هەموو ساڵێك زەکاتی لێ نەدرێت، ڕوو لە کەمی و نەمان دەکات. هەرچی ئەو پارەیەیە کە دەخرێتە وەبەرهێنانەوە، بەوەی بەردەوام ڕوو لە کردنەوەی مەیدانی

کار و ئەو مەیدانانەیە کە داهاتی میللی زیاد دەکات، خزمەت بە کۆمەڵگە دەکات.

٤- زەکات بوونی ئەو چینەی لە نێوان هەژار و دەوڵەمەنددایە و بە «چینی ناوەند» ناوزەد دەکرێت، بەهێز دەکات. توانای هاتنی هەژاران بۆ ئەم چینە ناوەندە زیاد دەکات. بەم جۆرە ئەم چینە -کە کۆمەڵگە لەسەر پێ ڕادەگرێت- قەیرانی گوزەرانی کۆمەڵگە کەم دەکاتەوە و جووڵە دەخاتە بازاڕەوە. بەم شێوەیە ئەوەی کە خودا قەدەغەی کردووە «سامان تەنها لە دەستی دەوڵەمەندان بێت و بچێت»، لەناو دەچێت. چینی ناوەند، ئەو جیاوازییە زۆرەی نێوان هەژار-دەوڵەمەند ناهێڵێت، یان هەر هیچ نەبێت کەمی دەکاتەوە...

٥- زەکات کە هەستی بەدەمەوە چوون و پشت یەك گرتنی نێوان خەڵکی دەژیێنێتەوە، پێکەوە سازان و هارمۆنیای نێو کۆمەڵگە مسۆگەر دەکات. بۆ ئەوەی کۆمەڵگە ساغڵەم و بەهێز بێت، وا پێویست دەکات مرۆڤەکان یەکدییان خۆش بوێت. لەسەر پێ وەستانی خۆشەویستیی نێوان مرۆڤ و گرووپە جیاوازەکانیش، بەندە بە پشت یەك گرتنی ماددییانەی یەکدی. نزیکیی بە دڵ و گیان و گەرموگوڕیی نێوان ئەو کەسانەی هاریکاریی ماددیی یەکتری دەکەن، بەئاسانی لەژێر کاریگەریی ناحەزانی جڤاك تێکناچێت. پێغەمبەریشمان (دروودی خودای لێ بێت) بە فەرموودەی: "زەکات

پردی ئیسلامه"، گوزارشت لەمه دەکات. هەر بۆیە ئەو ئایدۆلۆژیا زیان بەخشانەی کە لە ئەنجامی جیاوازیی چینایەتیی نێوان مرۆڤەکانەوە هاتوونەتە گۆڕێ، ناتوانن ئەوەندە لەنێو موسڵمانانداـ کە گرنگی بە زەکات و خێر دەدەن- بڵاو ببنەوە.

٦- زەکات گەرەنتییەکە بۆ پاراستنی بونیادی کۆمەڵایەتی لە ڕاپەڕین و داگیرکاریی و گێرەشێوێنیی. هەر بەڕاستیش ئەگەر چاوێك بە مێژووی جیهاندا بخشێنین، دەبینین کە گشت گەندەڵی و داگیرکاری و کارە ناڕەواکان لە دوو ڕستەوە سەرچاوەیان گرتووە، یەکەمیان: «با من تێر بم، ئیتر ئەوانی تر دەمرن نامرن بە من چی؟!»، دووهەمیشیان: «تۆ لە ڕەنج داندا نغرۆ ببە، تا من لە خۆشی و نیعمەتەکاندا بحەسێمەوە. تۆ بیکە تا من بیخۆم. ڕەنجدان لە تۆ و خواردنیش لە من!»

تا ئەوەی کە ئەم هزرەی دونیای مرۆڤایەتی بەرەو داڕمان و لەناو چوون دەبات و لە ڕەگەوە هەڵیدەکێشێت زەکاتە.

٧- ئەوەی کە ناوبڕی نێوان دارا و نەداران لا دەبات و تۆوی پەیوەندیی و دۆستایەتی و خۆشەویستی لەنێوانیاندا دەچێنێت، زەکات و یارمەتیدانی یەکترە. ئەگەر زەکات و یارمەتی دانی یەکدی لەنێوان ئەو دوو چینە نەمێنێت و بە بۆچوونێکی ماددییانەوە و تەنانەت لە بەرانبەر یارمەتیدانەکانیشدا چاوەڕوانیی پاداشتی قورس

بکرێت، جیاوازیی نێوان ئەو دوانە قووڵتر دەبێتەوە، پەیوەندیی نێوانیان دەپچڕێت و هەستی دوژمنداریی گەشە دەسەنێت. هەر لەبەر ئەمەش لە هەژارانەوە بۆ دەوڵەمەندەکان، لەبری گوێڕایەڵی و خۆشەویستیی، هەوڵی دەست بەسەردا گرتن و هەستی ئێرەیی پێبردن بەرز دەبێتەوە. لە دەوڵەمەندەکانیشەوە بۆ هەژاران، لەبری بەزەیی پێداهاتنەوە و یارمەتیدان و بەدەمەوە چوون، زوڵم و فشار و سووکایەتی پێکردن دادەبارێت. دەوڵەمەندەکان بەهۆی ئەو ئیمکانییەتانەی هەیانە، لەکاتێکدا کە پێویستە بە خاکساری و بەزەیی پێداهاتنەوەوە مامەڵە بکەن، بەخۆ دەنازن و بوغرا دەبن. هەژارەکانیش دەپلیشێنرێنەوە و سووکایەتییان پێدەکرێت.

بەڵێ، بۆ ئەوەی ئەم بارە خەمناکەی کە لە سەراپای جیهاندا بەدی دەکرێت، لەناو ببرێت، دەبێت زەکات و سەدەقە و پەرستشە هاوشێوەکانی تریان بهێنرێنەجێ. کەواتە زەکات ئەو فەرمانە خوداییە پڕخێر و بەرەکەتەیە کە زیندوێتی و ڕێکیی بە کۆمەڵگە دەبەخشێت.

***

دوای ئەوەی بەم جۆرە سوودەکانی زەکات هاتنە ڕوون کردنەوە، یەکێك پرسیاری ئەوەی کرد کە کێن ئەوانەی زەکاتیان لەسەرە.

– ئەگەر بمانەوێت بە کورتی بیڵێین، هەموو ئەو موسڵمانە ژێرە باڵقانەی هەبوونن، ئەم پەرستشەیان لەسەرە.



● ململانێی ڕەنج – سەرمایە، لە جیهانی مرۆڤایەتیدا بووە بەهۆی گەلێک تەنگژە.

– باشە، مامۆستا! بەپێی ئاینەکەمان کێن ئەوانەی بە هەبوون دێنە ئەژمار؟

– ڕۆڵە گیان! ئەمە باسێکی جیایە و زۆر ئاو دەکێشێت. ئەگەر حەز دەکەن، لە وانەیەکی تردا ئەمەتان بۆ باس دەکەم...

– مامۆستا! ئەگەر ئێستا بەکورتییش بێت، باسی بکەیت، زۆر باش دەبێت، چونکە خەڵکی عادەتیانە کە باس دێتە سەر بەخشین، خۆیان بە دەوڵەمەند دانانێن. هەموو خۆی پێ حاڵ مامناوەندییە. هەر بۆیە ناوی دەوڵەمەند بێ، بەس وەهبی کۆچ و ساکیب سەبانجی[1] بە مێشکدا دێن.

---

١– دوو گەورە ملیاردێری تورکیا بوون–وەرگێڕ

چاودێر قسەکەی هەق بوو. هەر بەڕاستی کە باس دێتە سەر بەخشین، زۆر کەس تەنانەت خۆی پێ هەژاریشە.

– دە باشە، مادام با بە چەند ڕستەیەك باس لەوانە بکەین کە ئاینەکەمان پێی وایە دەوڵەمەندن: ئەوانەی کە زەکاتیان لەسەرە، یان بە گوزارشتێکی دی، ئەوانەی بە تێڕوانینی ئاین دەوڵەمەندن، ئەوانەن کە هەموو پێویستییەکانیان دەستەبەر بووە. بۆ کەسێکی ئاسایی، دوای ئەوەی کە سەرجەم پێویستییە سەرەکییەکانی دەستەبەر بێت و قەرزیشی لەسەر نەبێت، هێشتاش ماڵ و سامانێکی دیاری هەبێت، دەوڵەمەندە و زەکاتی لەسەرە. ئەم پێوەرەی سامانداریی، بەپێی خاوەنداریی ماڵ و سامانەکە دەگۆڕێت. بەڵام با من یەك دوو نموونەتان بۆ بێنمەوە کە زۆر دەهێنرێنەوە: بۆ نموونە، ئەوەی کە بە لایەنی کەم ٨٠,١٧ گرام زێڕی هەبێت، بە دەوڵەمەند دێتە ئەژمار. ئەگەر دوای پێداویستییە سەرەکییەکانی و لە دەرەوەی قەرز، ٨٠,١٧ گرام زێڕ یان زیاتری هەبێت، زەکاتی لەسەر دەکەوێت. ئا ئەم کەسە، دەبێت چل یەکی ئەم بڕە زێڕە –واتە دوو گرام زێڕ– وەك زەکات ببەخشێت بە هەژاران.

یان با بیر لە یەکێك بکەینەوە کە ئاژەڵداریی دەکات. ئەم پیاوە ٨٠ سەرە مەڕی هەس. بەو پێیەی لەسەریەتی چل یەکی بە زەکات

بدات، دەبێت دوو سەر مەڕ، یان نرخەکەیان، وەك زەکات بدات بە هەژاران.

ئەم جارەشیان فەیلەسووفی پۆل خۆی دەخزێنێتە نێو قسەکانەوە:

– مامۆستا! ئەگەر وا بێت، ئێمە تا هەتایە پەرستشی زەکات بەجێ ناهێنین.

– نا، کوڕم! تاهەتایە نا... ڕەنگە ئێستا... بەڵام ئیششەڵڵا لە ئایندەدا فرە دەوڵەمەند دەبن. ئەو سا زەکاتی خۆتان دەدەن و خێری خۆتان بەدەست دەهێنن.

– بەڵام ئەی ئەگەر دەوڵەمەند نەبووین، ئەو کات ناتوانین ئەم پەرستشە کە ئەوەندە گرنگە، بێنینەجێ و ناشتوانین ئەو پاداشتە زۆرەی کە باستان کرد لای خودا هەیەتی، وەربگرین. ئایا ئەمە نادادی نییە؟

– نەخێر، بە هیچ کلۆجێك نادادی نییە. چونکە ئەگەر خودای گەورە هەموو کەسێکی ئەم دونیایەی بە هەبوونی و دەوڵەمەندی بەدیبهێنایە، ئەو کاتیش هەر نەدەتوانرا پەرستشی زەکات بهێنرێتەجێ، چونکە دەبێ کەسانێکی هەژاریش هەبن وەریبگرن. ئینجا دونیایەك کە هەمووان تێیدا دەوڵەمەند بوونایە، دەبوو بە دونیایەکی بێ هاوسەنگیی و دوور لە ئارامی. بۆ ئەوەی بتوانین

ژیانێکی پڕ لە هاوسەنگیی و ڕێکوپێك بژین، خودای گەورە وەك چۆن لـە ڕووی شـکڵ و شـێوەوە جیـاواز خولقانـدووینی، ئـاواش لـە ڕووی گوزەرانەوە جیـاواز خولقانـدووینی. ئیـی تـر، هەنـدێك دەوڵەمەنـدە و هەنـدێك هـەژار، هەنـدێکی تـریش مامناوەند...



- دونیایەك هـەمووان تێیـدا دەوڵەمەنـد بوونایـە، دەبـوو بـە دونیایـەکی بـێ هاوسـەنگیی و دوور لە ئارامیی.

بەم جۆرە جیاوازییەکان بۆ بەڕێوەچوونی کاروبارەکـانی ژیـان بـە بێکەموکوڕیی، هەر دەبێ هەبن. ئەگەر هەمووان دەوڵەمەنـد بوونایـە، ئەی کێمـان لـە کارگەکانـدا بکردایـە کرێکـار؟ کێمـان لـە کۆڵانەکانـدا بکردایە پاککەرەوە؟ کێمان لە بەندەر و گەراج و کۆگاکاندا بکردایەتە حەماڵ؟ مانای وایە لە دونیایەکدا کـە هـەمووان بەڕێوەبـەر بوونایـە، هەنـدێك کاروبـار -کـە زۆر گـرنگن و ژیـان لەسـەریان بەنـدە- ڕایـی نەدەکران و هەر بۆیەش دونیا لە ماوەیـەکی کەمـدا دەبـوو بـە شـتێك مایەی گوزەراندن نەبێت... ئەمـە سـەرباری ئـەوەی کـە مـەحاڵ بـوو

هـەمووان خـاوەنی هـەمان داهـات بوونایـە. چـونکە ژیـری و توانـا و خێرایـی کـارکردنی هـەموو مرۆڤـەکان، وەك یـەك نـین. خـۆ ئەگـەر سـەرباری ئەمـە، هێشـتا بـاری گـوزەرانی هـەموویان لـە یـەك ئاسـتدا بوایە، ئەوە دەبوو بـە شـتێك کـە لەگـەڵ دادگەریدا نەیەتـەوە. ئەمـە وێڕای ئەوەی کـە بـۆ هـەر جـۆرە کارێـك، جـۆرە مرۆڤێـك لـە توانـا و ئاستی جیـا پێویسـتە. ئەگـەر بـۆ کـاری جیـا جیـا، هـەمان پاداشـت هەبووایە، ئەوەش هەر نەدەبوو بە دادگەریی. ئەو کات لەبـەر ئـەوەی پاداشت یەکسان دەبوو، هەر کەسە و دەچووە سـەر کـارە بچووك و ئاسـانەکان، کـارە گرنگـە پێویسـتەکانیش کەسـیان نـەدەبوو ڕایانپەڕێنێت. بەم جۆرەش، بـەهۆی فـەرامۆش کردنـی ئـەو کارانـەی ژیان پێیانەوە بەندە، ڕێککاریی ژیان دەشێوا.

***

سوودێکی تری زەکـات ئەوەیـە هـانی موسـڵمانان دەدات کۆشـش بکـەن بـۆ ئـەوەی بگـەن بـە ئاسـتێك بتـوانن زەکـات بـدەن. ئـەوە هەسـتێکی زۆر جوانـە کـە هـەوڵی دەوڵەمەنـد بـوون بـدرێ تـەنها بـۆ ئەوەی یەکێك لـە پایـەکانی ئیسـلام بهێنرێتـەجێ. مـن گەورەیـەکمانم بینیوە کە بەڕاستی ئەم هەستەی هـەبووە. ئـەو کەسـە بەختـەوەرە، حیسـاباتی سـاڵێکی خـۆی کردبوو، کـە بـۆی دەرکـەوتبوو ئـەو سـاڵە یەکەم ساڵییەتی زەکاتی بکەوێتە سەر، یەکـەمین ئیشـی ئـەوە بـووە

چووبوو دوو ڕکات نوێژی شوکرانەی کردبوو. شوکرانە کردنی خودا بە فرمێسك ڕشتنەوە لە بەرانبەر ئەوەی کە ئەرکێکی نوێت کەوتووەتە سەر شان، بەڕاستی هەستێکی جوانە، ئەی وا نییە؟

پشت بە خودا، ئێوەش ئەم خۆشییە لە ژیانتاندا دەچێژن...

بەڵام لەسەر قسەی ئەو قوتابییەم – کە ئەو پرسیارەی کرد و ئەو ڕۆژەی زۆر بە دوور دەبینی کە دەوڵەمەند ببێت و بتوانێ زەکات بدات، بڕیارم دا ئەوەیان بۆ ڕوون بکەمەوە کە زۆر شێوازی دیکەی یارمەتیدان هەیە:

– ڕێی یارمەتیدانی خەڵکی، تەنها بە زەکاتدا تێناپەڕێت. سەدەقەش هەیە... ئەوەش هەر خێرە و دڵی هەژاران خۆش دەکات. ئێوە بەو توانا سنووردارەی ئێستاشتانەوە، دەتوانن سەدەقە بدەن و خێر و چاکە بە دەست بێنن. ئەگەر لە کاتێکدا کە خۆتان یەك لەسەر یەك لەفە دەخۆن، لەفەیەکیش بۆ ئەو هاوڕێیانەتان بکڕن کە پێیان ناکڕێت، یان هەر شتێکی تر لە تواناتاندا بێت، بۆیان بکڕن و پێیان بدەن، ئەوە هەموو ئەمانە خێرن. ئەوە نییە زۆربەتان لە ڕەمەزاناندا، بەر لە جەژن سەرفترە دەدەن، ئا وەك ئەوە... ئەوەش زەکاتی جەستە و تەندروستیتانە.

نابێت ئەوەش لەبیر بکرێ، کە خێر و سەدەقە تەنها بە پارە و لەفە و قەڵەم و دەفتەر نییە... ڕێی تریشی هەیە. بۆ نموونە کاتێك

خۆتان له دهرسێکدا باشن، بێن و بیدهنهوه به هاوڕێیهکتان که وهك ئێوه لێی تێناگات، ئهوهش خێر و زهکاته. ئهوهش زهکاتی ئهو زانیارییهیه که خودا پێی داون. وهك چۆن یارمهتیدانی هاوسێیهکتان له ههڵگرتنی دار و ڕهژووش، زهکاتی تواناتانه... تهنانهت ڕووخۆشییش سهدهقهیه. ئهمهش سهدهقهی ئهو دڵخۆشییهیه که هان تێیدا. لهبیرتان نهچێ، به بزهکردن له بهرانبهر هاوڕێیهکتاندا که دڵی تهنگه و خهمی ههیه، بهقهد خێر کردن به ههژارێك چاکه بهدهست دێنن...

ئهگهر له ئهسڵی مهسهلهکه بڕوانن، ههموو شتێکی باش و بهسوود، ههموو ئیشێکی خێر، خێر و چاکهیه. ههر وهك چۆن ههموو شتێکی خراپ و زیان بهخش، ههموو ئیشێکی خراپ، یاساغ کراوه و ههر بۆیهش به گوناه دانراوه.



## بەدوادا گەڕان، لێپرسین

یەکێك لە جوانترین ڕووەکانی ژیان، ئەوەیە کە خەڵکی بە دوای یەکدا دەگەڕێن. باشە بۆ کەسێك بەدوای کەسێکی دیکەدا دەگەڕێت؟ لەبەر ئەوەی خۆشەویستە لای و حسێبی بۆ دەکات، وا نییە؟ ئا ئەم جۆرە بەدوادا گەڕانە، یەکێکە لە بەتامترین خۆشییەکانی ژیانی مرۆڤایەتی. بەپێچەوانەوەش، بەدوادا نەگەڕان، هۆکارێکی گەورەی دڵتەنگییە.

تۆ بڵێی بۆ من باسی ئەمانە بکەم؟ ڕۆڵەکانم! پێویستە لەسەرتان هەوڵ بدەن ببن بە کەسانێك کە حسێب بۆ کراو و خۆشەویست بن و بەو هۆیەشەوە خەڵکی بەدواتاندا بگەڕێن و بیرتان بکەن. هەر وەك پێویستە هەوڵ بدەن لەو کەسانەش بپرسنەوە و بەدوایاندا بگەڕێن،

که کەسیان نەماوە لێیان بپرسێتەوە و بەدوایاندا بگەڕێت، یان بڵێین کەم بووەتەوە.... بەتایبەت بەساڵداچووەکان... ئەمە هەم ئەرکێکی مرۆییە، هەمیش پەرستشێکە کە خێری زۆری لێوە دەست دێت.

بەدوادا گەڕان و لێپرسرانەوە هەموو کاتێك باشە، وەلێ لە هەندێك کاتدا مرۆڤ وای لێدێ چاو لە دەرگا بێ. قەت ئێوەش واتان بەسەردا نەهاتووە کە بەوپەڕی پەرۆشییەوە چاوتان لە هاتنی کەسێك بووبێت و لە سەردانکەرێك گەڕابن؟ مرۆڤ لە کاتی نەخۆش کەوتندا لێوان لێو دەبێت لەم هەستە. بینینی خۆشەویستێکی، ئاشنایەکی بە دیار سەرییەوە، دیتنی دەمێکی بەخەندە، بیستنی قسەیەکی خۆش، چ ئاسوودەییەکی گەورە بە نەخۆشەکان دەبەخشێت!...

لە هەندێك دۆستی بچووکمەوە ژنەفتم و فرە هەستم بزوا. دەزانن چی دەکەن ئەوان؟ چوونە کاتی سەردانیی چەند نەخۆشخانەیان زانیوە. چەند هاوڕێیەك پێکەوە کۆ دەبنەوە و چەند دیارییەکی بچووك دەکڕن و سەر دەکەن بە نەخۆشخانەکاندا. بۆ سەردانی کێ؟ بۆ سەردانیی ئەو نەخۆشانەی قەت نەیانناسیون. سەیر دەکەن کام نەخۆش سەردانکەری کەمە، دەیخەنە نێو خۆشییەکی بێسنوورەوە.

هەمووومان ئەوە دەبینین کە لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا، وەفا و دۆستایەتی زۆر لە کورتیی داوە. لە هەلومەرجێکی وادا، ئەوەی کە ئەم دۆستە بچکۆلانانەم پێی هەڵدەستن، بەڕاستی زۆر هەستی

بزواندم. ئافەرین بۆیان. بەڕاستی دەرسێکی گەورە و جوان فێری هەموومان دەکەن، بەتایبەت ئەو گەورانەی کە سەردانی نزیکترین کەسەکانی خۆیان ناکەن.

ئەریٚ خوشك و برا خۆشەویستەکانی تریشمان نایانەوێت هەمان شت تاقی بکەنەوە؟ تاقیی بکەنەوە، هەست بەوە دەکەن و بە چاوی خۆیان دەبینن کە ئەمە چ سەرچاوەیەکی گەورەی بەختەوەرییە. دڵەکانمان بۆ گەرم بوونەوە حەوجەیەکی زۆریان بەم هەستی دۆستایەتیی و ئەمەکدارییە هەیە.





# مرۆڤ چۆن دەبێ بە مرۆڤ؟

مرۆڤ لە هەموو شتێك کەمتر عەودالّی خۆیەتی. ئەمە لە کاتێکدا کە خۆی گەلێك لەو شتانەی عەودالّیانە، پڕ هونەر و نەزانراو و ئالّۆزترە. مرۆڤ بەر لەوەی مەتەلّی مرۆیەتی حەل بکات، هەلّدەستێت مێشکی خۆی بە نەزانراوەکانی ترەوە خەریك دەکات. بە جۆرێك کە مەراقی ئێمە، تەنانەت لە تەمەنەکانی منداڵییشدا، لەو شتانە دەکۆلّێتەوە، کە زۆر لەو دیوی ئەم زەوییەوەن، لەسەر بۆشایی ئاسمان و بێ کۆتا دەوەستێ.

پرسیاری «مرۆڤ چییە؟»ش بەردەوام لە پلانی دووەمدا دەمێنێتەوە، ئاوەز هەلّناسێ بەوەی لێی بکۆلّێتەوە و ماهییەتەکەی ئاشکرا بکات. (یونس ئەمرە)ی شاعیر، چەند جوان دادەبەزێتە سەر

ئەوانەی ڕازەکانی خۆیان کەشف ناکەن و خوو دەدەنە قووڵاییيەکانی ئاسمان و زەوی:

زانســـت، عیلم و زانینە
زانســـت خـۆ نـاسـینـە
تۆیەك کە خۆت نەناسی
تو خوا ئـەوە زانینـە؟!

«خۆت بدۆزەرەوە، خۆت بناسە» ئامۆژگاریی هاوبەشی گشت دانا و فەیلەسووفان و تەنانـەت پێغەمبەرانیشە(سـەلامی خوایـان لەسـەر بێ). کەچی سەرباری ئەمە، ئەوەی کە مرۆڤـایەتی کـەمترین گـوێ و گرنگیی پێـدەدات، ئـەم ئامۆژگارییەیـە. (محەمـەد عـاکیف)ی شـاعیر دەڵێت:

"مرۆڤ لەسەریەتی دوو شت بزانێت: حـەددی و حیسـابی... مـن حەددی خۆم دەزانم، وەلێ قەت نەمتوانیوە حیسابم بزانم..."

مرۆڤی ئەمڕۆش، چەندێك دوور کەوتووەتەوە لەوەی ئەو حەددەی عـاکیفی کـردووە بـە عـاکیف بزانێـت، ئەوەنـدە خـەریکی حیسـاباتە. ئەوەی کـە بـووە بـە مـاددە پەرسـتێکی وا کـە حیسـابی قـرووش بـە قرووشی خۆی دەزانێت، لەناو چ گێژاوێکی ترسناکی حەدد (سنوور)ی خۆ نەزانیندایە، ئەی وا نییە؟ مرۆڤ کە وای لێهات حیسابی خۆی باش بزانێـت، بـەڵام خـۆی نەناسـێت و حـەددی خـۆی نـەزانێت، بـوو بـە

خۆپەرست و وای لێهات تەنها و تەنها لە بیری گەدەی خۆیدا بێت. بەو جۆرە حەددی خۆی تێپەڕاند و زۆر ئەولا چوو. بە جۆرێك، بەهۆی تەژی بوونی لە هەستی متمانە بەخۆ بوون، نەفسی خۆی کرد بە فیرعەون و بە لەخۆبایی بوونێك کە ئەقڵ نەیبڕێ، لە گشت هەستە مەعنەوییەکانی دوورکەوتەوە. بەو جۆرە مرۆڤ بە خۆ نەناسین و سنوور بەزاندنی، دەستی لە مرۆیی کێشایەوە. لە ناو ئەم گەشتەی خۆ ون کردنەدا، وای لێهات لە خودای گەورەش یاخی ببێت. کە بڕیار لە دەست خۆی نەما و خۆی ون کرد، ئاساییە ئەقڵیشی لە دەست بدات، ئەی وا نییە؟

وای لێهاتووە لەم دونیایەدا شتە نائاساییەکان بوون بە ئاسایی، مرۆڤ لە دەست خۆی و ڕاستییەکانی خۆی هەڵبێت.

ئیتر یەکێك شەو و ڕۆژ لە خەمی چوونە بۆشایی ئاسماندایە و یەکێکی تر خەریکی هەڵزنانە بە سەر لوتکەی ئەڤەرێست و... هتد. ئەرێ بۆ چما ئاسوودەیی و کامەرانیی لەسەر مانگ یان قووڵاییەکانی تری بۆشایی ئاسماندا هەیە؟! مرۆڤ لەوەوە کە لە بەرزاییەوە بڕوانێتە مرۆڤ، گەیشت بەوەی لە هەوڵی ئەوەدا بێت لە بەرزاییەوە بڕوانێتە زەویش. بەڵام ئەم خۆپەرستی و خۆ بە گەورە زانین و بوون بە فیرعەونییەی نەفس، چ خۆشییەکی پووکەش و بێ بنەمایە... چ تامێکی تاڵە!...

ئەی مەستیی... ماوە کاتییەکانی خۆ ون کردن و دەستبەردار بوون لە ئەقڵ، ئایا لە باریدایە مرۆڤ دڵخۆش بکات؟

هەڵبەتە باڵا بوون و بەرزبوونەوە، مافی هەموو مرۆڤێکە. وەلێ ئەمە بە هەڵزنانە سەر ئەڤەرێست نایاتە جێ. بە کێبڕکێی گەشتە ئاسمانییەکانیش هەر مەحاڵە. مرۆڤایەتیی تەنها بەوە بەرز دەبێتەوە کە شوێن پێی ئەو نێردەیەی خودا (دروودی خودای لێبێت) هەڵبگرێت کە بە پەرجووی میعراج بەرزبووەتەوە. هەر بەوەش بەرزیی ناخ و دەرەوە بە دەست دێنێت، چونکە بنچینەی ئەم بەرز بوونەوەیە، تەنها تێپەڕاندنی سروشت نییە، بەڵکو تێپەڕاندنی نەفس و گشت هەستە سووك و ماددییەکانە. بەرزبوونەوەیەکە لە بوون بە فریشتە بەرزتر.

ئەو کەسانە چۆن لە بەرزتربوونەوە لە فریشتەکان دەگەن کە سووکایەتی بە مرۆڤ دەکەن بە ناوی ئەوەی جۆرە گیاندارێکە و لە ڕەگەزی مەیموونەوە هاتووە؟ مرۆڤ پڕهونەرترین ئافەریدەی خودای گەورەیە. ئەگەر بێت و ئەو توانا بێهاوتایانەی بدۆزێتەوە کە هەیەتی و گەشەیان پێبدات بەرز دەبێتەوە. ئەو کات بۆیشی دەردەکەوێت کە ئەوەی ئینسان دەکات بە ئینسان و بگرە دەیکات بە سوڵتانیش، تەنها و تەنها ئیمانە.



## عومەر سەیفەددین و «یەکەم نوێژ»

عومـــەر ســـەیفەددین چـیرۆك نووســێکی بەناوبانگــە، ٦٩ ســـاڵ لەمەوبەر کۆچی دوایی کردووە. گەنجان زۆر چێژ لـە خوێندنـەوەی چیرۆکەکانی وەردەگرن و دەکەونـە ژێر کاریگەرییانـەوە. بەنـدە لـە پۆلی چوارەمی بنەڕەتییەوە کەوتوومەتە خوێندنـەوەی چـیرۆکەکانی. چـیرۆکەکانیم هێنـد لا خـۆش و خۆشەویسـت بـوون، چـەند جـار لـە خەونمـدا دەمدیتنــەوە، وام لێهـاتبوو وەك ئـەوەی خـۆم لـەناو ئـەو چـیرۆکانەدا ژیـابم. هــەرگیز لـەبیرم ناچـێت کـە چـەند ڕۆژ لـەژێر کاریگـەریی چـیرۆکەکانی بـە ناوەکـانی «شـانەی ئـاژەڵ» و «خـوێن بایی»، نەمدەتوانی دەربچم. ژیانی نووسـەریی عومـەر سـەیفەددین — کـە ئـەو چـیرۆکە خـۆش و کاریگەرانـەی نووسـیوە، تـەنها ٨ سـاڵی خایاندووە و لە تەمەنی ٣٦ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.



بەشێك لە چیرۆكەكانی عومەر سەیفەددین كەوتوونەتە نێو كتێبی خوێندنی قوتابخانەكانەوە. بۆیە زۆرێك لە چیرۆكەكانی لای گەنجان ناسراون. بەڵام لە زۆرێك لە پۆلەكانم پرسی، كەسم نەبینییەوە چیرۆكی «یەكەم نوێژ»ی ناوبراوی خوێندبێتەوە. بۆیە بڕیارم دا ئەو چیرۆكەی، لە یادداشتنامەكەمدا تۆمار بكەم. چونكە لەو چیرۆكەیدا، باسی ئەو یەكەم نوێژی بەیانییەی دەكات، كە دایكی پێی كردووە، لە كاتێكدا كە تەمەنی تەنها ٦ ساڵان بووە. ئەو یەكەم نوێژەی كە كردوویەتی عومەر سەیفەددینی خستووەتە خۆشییەك بۆ هەتایە لەبیری نەكات. یادگاریی ئەو خۆشییە لەبیر نەكراوەشی كە بۆ ئەمڕۆمان مابێتەوە، چیرۆكی «یەكەم نوێژ»ییەتی...

دەی با گوێ بۆ عومەر سەیفەددین هەڵخەین:

– وەی! ئەو بەیانییە چ ساردێك بوو!... ئەو حەلەی گەرمیی نوێنەكەمم جێهێشت، بە دەست باهۆزە سەرشێتەكانەوە كەوتمە ناڵە. پێیە پەتییەكانمم خستە ناو ئەو نەعلانەمەوە كە هەرچی سەرمای ئەو شەوە هەبوو مژیبوویان. بابە هەڵمەت بەرەكان بە جامەكانیاندا دەكێشا، هەستم بە تەزین دەكرد لەبەر سەرمای ئەو شەوە، كە

هێشتا لە ناخمدا مابووەوە. خزمەتکارەکەمان هەر لە خەودا مابوو. حەزم نەدەکرد لەو سەرما و سۆڵە جەرگبڕەدا لە جێ دەری بکەم. دەرگای ژوورەکەمم کردەوە. سەرما زستانییەکەی دەرەوە، زللەی دەکێشا بە دەموچاو و دەستەکانمدا. لەژێر ئەو زللە بێڕەحمانەدا، قۆڵەکانم هەڵکرد و دەستنوێژم گرت. کە گەڕامەوە ژوورەکەم، گەرمییەکی درۆزنانە، وەك هەناسەیەکی دڵ دانەوە، لەژێر خاولییەکەوە بەر قۆڵەکان و دەموچاو و قژە تەڕ بووەکەم دەکەوت. یەکەم ڕووناکیی ئاسۆ، خەریك بوو پەردەی سەرما و تاریکیی ئەو شەوەی دەکردەوە و هێدی هێدی زیادی دەکرد. چوومە بەر پەنجەرەکە. ئەو خانووانەی لە پێشەوە و لە ژێر پێکانمەوە دیار بوون، وەك ئەوەی خەریکی تەواو کردنی مۆتەکەی نێو خەونێکی ئەبەدیی بن، بێگیان و زیندوێتی بوون. دەریاش، لەنێو مردوێتییەکی نیلیی بێ سنووردا، لە خەودا بوو و بەهۆی شەپۆلەکانی ئەو بەیانە دەلەرییەوە و بە شەپۆڵە سپییەکانی هێڵی جیا کردنەوەی بەسەر کەنارە دوور و تەماوییەکاندا دەکێشا.

هێشتا منارە پیرەکەی ئەو مزگەوتەی – ئەگەرچی کۆن و بچکۆلانە بوو، وەلێ لە ڕووی مەعنەوییاتەوە مەزن بوو و، لەناو خانووەکانەوە بەرەو ئاسمان بەرز بوویووەوە، چۆڵ بوو. دواتر... لە شەرەفەی منارەکەوە، سێبەری بانگ دەرێك کەوتە جووڵە.

پاڵتۆکەمم لە خۆم پێچا. ئێستاش ئەو بەیانییە پڕ لە ڕۆحانییەتەم بیر ناچێت، کە هەڵسامەوە و لەو سەرما تەزێنەرەدا و لەو دونیا تاریکەدا گوێم لەو بانگە گرت، کە وەك یادگارێکی دەنگ دانەوەی ئیلاهی، ترسێکی بەچێژی خستبووە قووڵایی دڵمەوە. وای بۆ پانزە ساڵ لەمەوبەر!...

***

چاك ئەو ڕۆژەم لەبیرە کە پانزە ساڵ لەمەوبەر، ئەو دایکەم کە ئێستا لە بازنەی دڵ دانەوەی زۆر دوورم، ئەو بوونەوەرە بەڕێزەی کە لە دونیادا لە هەموو شتێك زیاتر خۆشم دەوێت، بۆ یەکەم نوێژی بەیانی هەڵیساندمەوە. کاتێك لەسەر قەریوڵەکەی نێو ژوورە بچکۆلانەکەم - کە لەپاڵ ژوورەکەی ئەوەوە بوو، خەوتبووم، بە دەستە ناسکەکانی کە وەك ڕامووسانێکی ڕەق بەڵام پڕ لە سۆز، دەستی نایە سەر تەوێڵم، ئینجا بە پەنجە ناسك و باریکەلەکانی دەستی بە قژمدا هێنا و وتی:

- دەی عومەر گیان! هەڵسە... دەی هەڵسە، جەرگەکەم!

منیش چاوم کردەوە. چرا خنجیلانەکەی سەر مێزە بچووکەکەم کە لە گۆشەیەکی ژوورەکەدا بوو، هێشتا دەسووتا. ئاخ ئەمەم قەت لەبیر ناچێ، ئەمە وەك سەری پشیلە وا بوو، پەردە ئەسمەرەکانی

دوو پەنجەرەکەی ژوورەکەمی ڕووناک دەکردەوە و لە جامە سەوزەکانەوە بە چاوەکانی دەیڕوانی.

وتم:

– بەڵام دایکە گیان! هێشتا شەوە...

دیسان لە هەمان ئەو شوێنەی کە هەموو جارێک ماچی دەکرد، ماچێکی لە سەرووی برۆی چەپم کردەوە و بە دەم وتنی: "نا ڕۆڵە! سەعات دوانزەیە، دوایی وەخت نامێنێ."، بن باڵی گرتم و قیتی کردمەوە. نەعلە بچووکەکانم لە پێ کرد و چاوەکانم هەڵگڵۆفی و شوێنی کەوتم. بە هۆڵەکەدا ڕەت بووین و هەر زوو گەیشتینە ژوورەکەی. سۆبا نزم و ڕەشەکەی – کە لە زنجییەک دەچوو پێی لەسەر پێ دانابێت، بەدەنگ دەسووتا.



- ئۆوو... پەروینیش هەڵساوە.

پەروین خزمەتکارەکەمان بوو، خەریك بوو کتلییە زەردەکەی لە سۆباکە دادەگرت. دایکم وتی:

- پەروین هەموو بەیانیانێك هەڵدەستێ.

زۆر بەوە سەرم سوڕما کە لە کاتێکدا من قەت هەڵنەساوم، ئەو بەردەوام هەڵساوەتەوە. پاڵتۆکەیان لەبەر کردمەوە، قۆڵەکانیان هەڵکردم، لەپاڵ تەشتی دەستنوێژ گرتنەکە بە چۆکدا هاتم. دایکە گیانم بە دەم وتنی: "ئاواهی ماندوو دەبی."، کورسییەکی بچکۆلانەی خستە ژێرمەوە و منیش لەسەری ڕۆنیشتم.

- دەی بیسمیللا بکە...

پەروین ئاوە شلەتێنەکەی کرد بە دەستمدا و دایکیشم بە دیار سەرمەوە وەستابوو و دەیچپاندە گوێچکەمەوە:

- دەی دەموچاوت، قۆڵەکانت، ئەویش سێ جار...

کە لەبیرم دەچوو، ئاگاداری دەکردمەوە:

- ئە ئا، ئەی مەسحی سەر و شتی وا؟!

پاشان پێی دووبارە دەکردمەوە.

کە دەستنوێژ گرتنەکە تەواو بوو، لەگەڵ دایکمدا بە دەنگێکی نزم دوعامان خوێند و دەموچاو و قۆڵەکانمان وشك کردنەوە. پەروینیش پێکانمی وشك کردنەوە و گۆرەوییەکانی لەپێ کردم. بەبیرم دێ بۆ

خۆ گەرم کردنەوە، چوومە بەر سۆباکە. کە ئاوڕم دایەوە، بینیم دایکم خەریك بوو بەرماڵەکەی دادەخست. ئینجا سەرپۆشە سەوزەکەی لەسەر کرد و بانگی کردم:

– وەرە!

ڕۆیشتم. منی بچکۆلە لەگەڵ ئەودا لەسەر هەمان بەرماڵ، بە بەختەوەرییەوە وەك بێچوویەك لەپاڵ جەستەی ئەو دایکە مەزنە بەهەستەوە وەستام. بە یەك دوو قسە ئەو شتانەی پێ وتمەوە کە پێویستە بیانکەم و پێشتریش فێری کردبووم:

– دوو ڕکات سوننەت... ئەوانەی شەو فێریان بووی، دەیانخوێنیت. خۆ لەبیرت نەچوونە؟

– نەخێر...

– دە مادام، دەی...

ئەو تەکبیرەی ئیحرامی بە دەست بەرزکردنەوە تا سەر شانەکانی وەك ژنێك کرد، منیش بە دەست خۆم نەبوو، ڕێك لاسایی ئەوم کردەوە. دوای ئەوەی کە سوننەتەکەمان تەواو کرد، بە بزەیەکی کاریگەر و پڕچێژی دیدەکانییەوە وتی:

– ڕۆڵە! بۆ تۆ ژنیت؟!... ژنان ئاوا دەست پێدەکەن. تۆ کوڕیت، دەبێت دەستەکانت تا گوێکانت بەرز بکەیتەوە.

بە دەستە گەرمەکانیشی دەستە بچووکەکانمی تا گوێکانم بەرز کردنەوە:

- ئا ئاواهی...

هەروەها فێری چۆنیەتیی تەکبیرەی ئیحرامی پیاوانی کردم.

منیش بەو جۆرە تەکبیرەم کرد و بە دەم بیرکردنەوە لە (جیاوازیم لە دایکم، بۆ کوڕم و کوڕێتی چییە و، دیارە کوڕێتی جگە لە لێدانی کچان و زاڵ بوون بە سەریاندا، جیاوازیی تریشی هەیە)، نوێژەکەم تەواو کرد.

لە کاتی دوعا کردندا لە دایکمم پرسی:

- دایە! چۆن دوعا بکەم؟...

ئەو دوعای دەکرد و لەگەڵ جووڵەی لێوەکانیدا، لەچکەکەشی دەلەرییەوە. سەری دەجووڵاند. دوای ئەوەی دوعاکەی تەواو کرد، ئێستاش لە بیرمە، وتی:

بەر لە هەر شتێك لە بەرانبەر ئەوەی کە موسڵمانیت بڵێ: ئەی ئەو خودایەی گومان لە بوونتدا نییە! شوکرانەت دەکەم... دواتر بڵێ: خودایە! داوات لێدەکەم نیشتیمانەکەمان بپارێزیت... دواتریش بڵێ: خودایە! داوات لێدەکەم لەش ساغی ببەخشیت بە هەموو ئەو موسوڵمانانەی خەم و خەفەتیان هەیە، نەخۆشن و لە نەبوونی و

هەژاریدان... دوعا بۆ خۆشت بکە، دوعا بکە بۆ ئەوەی هەمیشە باش بیت و بە درۆکانی شەیتان هەڵنەخەڵەتێیت!...

ئەو دوعا سادانەم خوێند، لە میانەیدا بیرم بۆ لای ئەو کتێبە عەرەبییە دڕاوانە چوو، کە دایکم لەناو دۆڵابەکەیدا دایناپوون و هەر جارێك دەستکاریم بکردنایە، دەیوت: "کوڕە! ئەوانە کتێبی دوعان، دەستکارییان مەکە."

دایکم بەرماڵەکەی پێچایەوە و لێی پرسیم داخۆ دەخەومەوە یان نا. ئەریٚ خەوم دەهات؟ نەمدەزانی... وەڵامم نەدایەوە.

– دە مادام بڕۆ کتێبەکەت بێنە، با گوێم لە دەرسەکانت بێت.

– باشە.



بەخێرایی بەو هۆڵەدا تێپەڕیم کە کەمێك ڕووناك بووبووەوە. پەردەکانی ژوورەکەشم کەمێك سپێتییان تێکەوتبوو. چاوە سەوزەکانی چرا بچووکەکەی شەوانم، کوژابوونەوە و وەك دوو خاڵی ڕەش مابوونەوە. وەك بڵێی ئەو چرایەی شەوان بە دەم تەماشا کردنییەوە خەو دەیبردمەوە دەستی لە ژیان بەردابوو. کتێبەکەم کە لەسەر مێزە بچکۆلانەکەم بوو، برد و بە

ڕاکردن بۆ لای دایکم چووم. هیچ هەڵەیەکم نەکرد. دایکم شەوان دەیوت:

– پێش خەوتن، وانەکانت سێ جار بخوێنەوە، ڕۆڵە! کە دەخەویت، فریشتەکان وانەکانت پێدەڵێنەوە.

نازانم، ئەو فریشتانە ئەم شەویش وانەکانیان پێ وتبوومەوە، وا دایکم بە ئافەرینە بەسۆزەکانییەوە دەستی بە سەرمدا هێنا و بە دەم وتنی:

– هێشتا زۆری ماوە بۆ دەوامی مەکتەب.

منی لەسەر نوێنەکەی خۆی خەواندەوە. خەوم نەدەهات، هەر سەیری دایکمم دەکرد. لەچکە سەوزەکەی هێشتا هەر بە سەرەوە بوو، لەو تاریک و ڕوونەدا وەك خەیاڵ دەجووڵایەوە، قورئانەکەی هەڵگرت و لە بەردەم پەنجەرەکەدا، لەسەر تەپڵەکێك دانیشت و بە دەنگە ناسك و هەست بزوێنەکەی کەوتە خوێندنی. دایکم لەژێر ئەو لەچکە سەوزە گەورەیەیدا، وەك خوشکە مردووەکەم دەهاتە بەرچاو، و بە دەم گوێ گرتن لەو دەنگە خۆشەشی خەیاڵم دەڕۆیشت... ئەو ئاسمانە دووکەڵ ئاسا ڕەشەی لەژێر پەردەکانەوە دیار بوو، هێدی هێدی کاڵ دەبووەوە. چەند ئەستێرەیەکی دێر کەوتووش، وەك ئەڵماسکەلێکی شین و ناوازە کە کەوتبنە ناو ئەتڵەسێکی نیلیی تۆخەوە، دەدرەوشانەوە. دایکم وەك فریشتەیەك دەهاتە بەر چاو.

بەو خەیاڵەوە بیرم لە فریشتەکان دەکردەوە و وام بیردەکردەوە کە ئێستا فریشتەکان دەوری دایکە قورئان خوێنەکەمیان داوە، بەو خەیاڵانەوە خەیاڵم ڕۆیشتبوو. ئەگەر لە ڕۆژی پەسڵاندا گوڵان لەسەر ڕوخسارم نەمێنن و بچمە دۆزەخەوە، ئەوە هەست بە جۆشێك دەکەم لەو سەرەی برۆی چەپمەوە – کە بە هیچ جۆرێك نایاتە سووتان. لەو دایکەمم دەڕوانی کە لەو تاریکییەدا، وەك ڕووناکیی گوڵە شلێر دەبریسکایەوە... وەك بڵێی هەستم بەوە دەکرد کە ئەو فریشتە نەبینراوانە ئێستا باڵەکانیان بەسەر سەرمدا و بەو قژە زەردە پڕەمدا دێنن کە دایکم بەو قامکە ناسکۆلانانەی ئێستا قورئانی پێگرتوون، دەستی بەسەردا دەهێنان. بەو بیرکردنەوانەوە خەیاڵ بردمییەوە.

***

عومەر سەیفەددین، پانزە ساڵ دوای ئەم یادگارییە، بەحەسرەتەوە یادی ئەو ڕۆژانە دەکاتەوە. ئاوا هەستی خۆی دەردەبڕێت:

– ئاخ، منداڵێتیی بێ گوناهانەی ئەو دەمم و ئێستام... ژیانێکی بێ تام، بێ خۆشی، بێ خۆشەویستی، بێ ئەوین، بێ جۆش، بێ هەموو شتێك. ژیانێك کە هیچترە لە هیچ و پڕە لە چەرمەسەری.... ئەو ڕۆحە زامدارەی ئێستام بە دەست هیوا بۆگەنەکان، پەرۆشییەکان و بەو ئارەزووانەی کە لە ڕاستیدا ئەوەی بەها بێت نییانە و

گەیشتنیش پێیان زۆری دەوێ. بەکورتییەکەی ئەو تاریکییە بێ هۆ و تەحەممول نەکراوە، ئەو مەعنەوییات و دڵە بریندارەم. ئەوەی پانزە ساڵ لەمەوبەر ڕوویدا، ئێستا لام وەك ئەوە وایە کە خەونێکی ڕۆحانیی سەنگین بێت و ئەم شەو دیبێتم، ئاوام لەبیرە. لەم ژیانە فانییە پڕ لە واوەیلا و پەشیمانییە، ئەوەیە یادگاریی منداڵیم... ئێستا بیر دەکەمەوە، لە ژیاندا لە نەمانی ڕابوردووە بێچارە و بێبەزەییەکاندا، چ هیچییەکی غەریب، چ ناپێویستییەکی پڕ لە خەیاڵ کە دێت و دەڕوا، چ خێراییەکی سیخناخ لە نهێنی هەیە!...



## منداڵە دزراوەکان

ئەوان منداڵن یان گەنج؟ یانیش نەوجەوانگەلێکن تازە پێیان ناوەتە تافی لاوێتییەوە؟ بە دەستەکانیان دەموچاویان داپۆشیوە و هەنسك دەدەن، لە هەوڵی ئەوەدان خۆیان لەو ڕۆژنامەڤانانە بشارنەوە کە دەیانەوێت وێنەیان بگرن. یەکێکیان خۆی لە ملی دایکی ئاڵاندووە و ئەسرین دەڕێژێت. لەم ژوورەی بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشدا، فەرمانبەرەکان پێدەچێت بەو جۆرە ڕووداوانە ڕاهاتبن، بۆیە وا هێمن دیارن... هەرچی ڕۆژنامەڤانەکانە، لە خۆشیی ئەوەی وێنە و هەواڵێکی سەرنج ڕاکێشیان دەستکەوتووە، یەك لەسەر یەك فلاش لێدەدەن و وێنە دەگرن...

ئەوەی کە لە هەموویان زیاتر حەپەسابوو، دایکێك بوو لەناو کچە گەنجەکانەوە دیار بوو... چی بوو دەگریا؟! یان دڵخۆش بوو بەوەی کچەکەی دۆزیوەتەوە؟ یانیش لە بەینی گریان و دڵخۆش بووندا دۆش دامابوو و نەیدەزانی چی بکات؟ خۆ دووریش نییە چی هەستی هەیە لە بن هاتبن و ئیتر هەست نە بە خۆشیی و نە بە ناخۆشیی نەکات. گریانی نەدەهات. کێ ناڵێت ئیتر فرمێسك لە چاویدا نەماوە تا بتوانێت بیڕێژێت... هەستە تێکەڵ و پێکەڵەکان و هاواری بێدەنگی دڵی ئەو دایکە، لە چاوە ئەبڵەقەکانی دەخوێنرانەوە. پێم وابوو ئەو چاوە ئەبڵەق بووانەی، بەدوای ئەو خائینەدا دەگەڕا کە کچەکەی ڕفاندبوو. بەڵام ئای ئەمە چ گەڕانێکی بێ سوود بوو! کوا ئیتر لەم دەور و زەمانەدا، خائینی وا بێ ئەقڵ ماون کە ئاوا لەو گۆڕەدا بسووڕێنەوە؟ ئای ئەوان چەند زۆرزانن، چەند بەباشی دەزانن خۆیان وەك کەسێکی پڕ لە بەرائەت لەگەڵ دەوروبەرەکەیاندا بگونجێنن و تەنانەت خۆیشیان وا نمایش بکەن وەك ئەوەی هاوڵاتییانێکی زۆر بەناموس و ڕێکوپێك بن؟ ئەوان چۆن لە ژوورێکی وا پڕ لە ئاسایشدا دەبن؟

***

من لەناو ئەو بیرکردنەوانەدا بووم، داڵغەم ڕۆیشت و چوومە دونیایەکی دیکەوە. لەو دەمەدا ئەو کچە داماوانە کە هەر یەکەیان بە

تەڵەیـەکی بریقـەداری جیـاواز ڕاو کرابـوون، ڕادەسـتی خێزانـەکانیان دەکرانەوە، یان بۆ ناونیشانی ماڵەکانیان دەبران. (هەدیە)ش، دەبوو لەگەڵ مندا بچێتەوە مـاڵی خۆیـان. چـونکە وتبـووی کـە تـەنها بـەو جـۆرە، نەنکـە پیرەکـەی وەری دەگرێتـەوە. هەدیـە، تـازە قۆنـاغی بنەڕەتیی تەواو کردبوو. من کە لە کـارگێڕانی ئـەو قوتابخانەیـە بـووم کە ئەوی لێبوو، پێش خۆی نەنکیم دەناسـی. چـونکە ئـەو هێنـای لـە قوتابخانە قەیدی کرد و لە پێویستییەکانی لـە کتێـب و دەفتـەر و ... هتدی پرسی. ئەو ژنە هێند چوست و چالاك بوو، تەمەنەکەی پێیـەوە دیـاری نـەدەدا، ببووبـوو بـە هـەم دایـك و هـەمیش بـاوکی ئـەو ماڵـە. ئەگەرچـی خـاوەن بڕوانامـە نـەبوو، وەلـێ کەسـێکی زۆر ڕۆشـنبیر و تێگەیشتوو بوو. بە زمانزانی (ڕوومەلی) دەئاخفی.

لەناو ئەو مانتۆیەی کـە بـاڵا بەرزەکـەی داپۆشـیبوو، وەسـتانێکی بەویقارانەی هەبوو. بـە لەچـکە چـوار وەرزە سپییەکەشـی، سـەرنجی خەڵکیی ڕادەکێشا. هەدیەی نەوەیشی، خۆی ئاسا کچێکی نـەشمیلی باڵا بەرز بوو. بەڵام لەبری ویقارەکەی نەنکی، کەمێك بێسەروبەر بوو، زۆر پێدەکەنی و ئەوەندە بە لای دەرسەکانییەوە نەدەچوو.

پێدەچوو نەنکیشی هەستی بـەم حاڵـەی کردبێـت، بۆیـەکا هـەموو ڕۆژێك لەگەڵ خۆیدا دەیهێنا بۆ قوتابخانە. زۆربەی جاران، نـەنکی تـا گشت قوتابییـەکان دەچـوونە یەکـەم وانـەوە، چـاودێریی دەکـرد. وا

خۆی پیشان دەدا کە لەگەڵ (عەیشێ) خانی خزمەتکارماندا خەریکی حەکایەت کردنە، وەلێ چاوانی هەر لەسەر نەوەکەی بوو. جاری وایش هەبوو بە عەیشێ خانی دەسپارد، بۆیە دەمبینی ئەویش دووربەدوور چاودێریی دەکرد.

ڕۆژێک سکم بەو ژنە دونیادیدە بەتەمەنە سووتا کە هەموو بەیانییەک، بێ ئەوەی بڵێ بەفرە، بارانە، قوڕە، نەوەکەی -وەک قوتابییەك تازە چووبێتە قوتابخانە- دەهێنایە دەوام. بانگم کردە ژوورەکەی خۆمەوە. بەزۆر چایەکم پێ خواردەوە و لەو نێوانەشدا لێم پرسی:

- پووریێ گیان! دەبینم هەموو ڕۆژێك لەگەڵ ئێمەدا، بێ ئەوەی گوێ بەوە بدەی بەفرە، بارانە دێیتە قوتابخانە. لە تۆ بەولاوە، کەسێکی تر نابینم ئاوا لەگەڵ منداڵەکەیدا بێت و بچێت.

سەرەتا کەمێك شەرمنانە هەڵسوکەوتی دەکرد، نەیدەویست قسە بکات. بەڵام کە من هەر مکوڕبووم، وتی:

- ڕۆڵە! من تا ئەو ڕۆژەی دەمرم، هەموو بەیانییەك نەوەکەم دەهێنم و هەموو ئێوارەیەکیش دێمەوە بە شوێنیدا. چونکە ئەو بۆ من تاکە یادگارییەکە لە دایك و باوکی ڕەحمەتییەوە مابێتەوە. ناوی بە خۆیەوەیە، هەدیەی کوڕە تاقانەکەمە بۆ من. بۆیە بۆی بەخەمم.

لەبەر خاتری ئەو، هەرچییەکم هەبوو لە بولگاریا، لە ماڵ و سامان و خزم و خوێش، هەمووم جیٚ هێشتن و هاتم بۆ تورکیا.

چیم کردبێت بۆ ئەوم کردووە. لەو وڵاتەدا کە بووك و کوڕە داماوەکەمم لەدەست چوو، هەمان چارەنووس چاوەڕێی نەوەکەشمی دەکرد... ویستم هەر هیچ نەبیٚ نەوەکەم لە وڵاتی دایکمدا، وەك موسوڵمانێك پێبگات، ئاکار و بیروباوەڕ و ئەسڵ و فەسڵی خۆی ون نەکات. ئەو گرنگیدانەی نەمتوانی بە کوڕەکەمی بدەم، بەمی دەدەم. من لە پێناوی ئەم منداڵە و دین و نامووسی خۆم هاتم بۆ ئێرە. لەویٚ بمامایەتەوە نەمدەتوانی وەك ئێرە ئاوا بەدوایشییەوە بم و چاودێریی بکەم. لێرە هەر هیچ نەبیٚ ئەوەندەی پێم بکرێت بەتەنیا جێی ناهێڵم. سەرەڕای ئەو تەمەنەم، هەوڵ دەدەم لەگەڵیدا وەك هاوڕیٚ بم. چیی بویٚ پێم بکریٚ بۆی دەکرم. بەس بۆ ئەوەی ئازاری ئەو گۆڕستانەی باوانە غەریبەکەیم لیٚ بەجیٚ هێشت تۆزێك کەم ببێتەوە...

ژنە پیرەکە کە قسەکانی گەیشتە ئەمە ڕووی وەرگێڕایە لاوە، دەیویست چاوە تەڕ بووەکانیم لیٚ بشارێتەوە.

وتم:

– ئێوە، هەموو ڕۆژێك ئاوا ئەزیەت مەکێشن. من هەوڵ دەدەم بە دەوریدا بێم. با ئەوەندە کاژێرە چاوەڕیٚ نەکەی.

– سوپاست دەکەم، ڕۆڵە گیان! ئێ خۆ منیش هیچ کارێکی ترم نییە. ئەم منداڵە هەموو دونیای منە. دڵم بەوە دادەکەوێت بەدوای ئەوەوە بم. ئەو بێکەسە، نەفامە، ساویلکەیە، هەندێك ئارەزووی هەیە. تۆش بە دەوریدا وەرە، بەڵام من تا ئەو ڕۆژەی تەمەنم ماوە، وازی لێناهێنم. چونکە کوڕەکەم، بەهۆی ئەوەی نەمدەتوانی وەك پێویست بە دەوریدا بێم، لە تەمەنێکی زۆر گەنجیدا لە دەستم دەرچوو. ئازارەکەی ئەو گەلێك زیاترە. قەی ناکا، با ماندوو بم، بەس ناوچاوانمان سپی و دڵمان ئاسوودە بێت.

***

بەدرێژایی سێ ساڵان، ئاوا هات و چوو. بەقەدەر نەوەکەی دەوامی کرد. بەڵام مەخابن، دوا جار ئەوەی لێی دەترسا، هەدیە بەسەریدا هێنا... هەدیە، بەهۆی ئەوەی هۆگری بوونە هونەرمەند بوو، سەرەڕای ئەو هەموو چاودێرییەی نەنکی، لە ڕێی سەنتەرێکەوە کە بەنهێنی و لە ڕێی نامەوە پەیوەندیی پێوە کردبوون، ڕفێنرابوو. تا ئەوەی پانزە ڕۆژ دواتر، لەگەڵ چەندین کچە گەنجی تردا کە قوربانیی هەمان ئارەزوو بوونە، دۆزرابوونەوە و نێردرابوو بە شوێن کەسوکاریاندا. دەبوو من ئەم کارە زۆر سەختە بگرمە ئەستۆ. هەدیە ناونیشانی منی دابوو بە پۆلیسەکان. دەبوو من بیبەمەوە بۆ لای داپیری. لەبەر ئەوەی داپیری منی زۆر خۆش دەویست، ڕەنگ بوو

بەو جۆرە وەری بگرێتەوە و لێی خۆش ببێت. دەبوو منیش لەگەڵ هەدیە، لەبەری بپاڕێمەوە. ئەمە تکای هەدیە بوو لە من.

وتم:

– خاسە، بەس سەرەتا دەبێت من بتبەخشم. جا من بەخشیومی تا لای نەنکت واسیتەت بۆ بکەم تا لێت خۆش ببێت؟!



هەدیەی قوڕبەسەر کە هیچ ئومێدێکی بە ژیان نەمابوو، بەم قسەیەم نقەی لێبڕا. وەستا بوو و بەس ئەسرینە کپەکانی دادەباراند.

لە ڕێدا هەر بیرم لەوە دەکردەوە، چی بەو ژنە بەویقارە، بەو ژنە عابیدە بێژم کە لە پێناوی دین و ناموسدا، ڕێی کۆچی گرتبووەبەر؟ چی بڵێم بۆ ئەوەی نەوەکەی وەربگرێتەوە؟ ئەوە کارێکی ئەوەندە

زەحمەت بوو!... گەلێکم بیر کردەوە... چەندم کرد داکۆکی کردنێکی وام بە خەیاڵدا نەهات، کە منیش بە تاوانبار نەزانێت.

لە پڕێ لە هەدیەم پرسی:

– باشە، ئێستا چی بە نەنکت بڵێین؟

– نازانم. من ئەگەر قسەیەك هەبووایە بیکەم، ئەوەندە تەکلیفم لە تۆ نەدەکرد بێیت.

بەڵام وام هەست دەکرد کە هەدیە متمانەی بە ڕۆندکەکانی (فرمێسکەکانی) چاوی هەیە. چونکە دەمزانی لە کاتە زۆر تەنگانە و دژوارەکاندا، لە بەرانبەر پیرەژنەکەدا، دەست بۆ ئەو چەکە دەبات.

کە گەیشتینە ماڵەکە، بینیمان ئەو ژنەی کە پێشتر تەمەنەکەی هیچ پێیەوە دیاری نەدەدا، وەك ئەوە وا بوو دە ساڵ هاتبێتە سەر تەمەنی و، لەسەر نوێنێك لێی ڕاکشابوو. چاوی بڕیبووە خاڵێکی بنمیچەکەوە و جووڵەی لەبەر خۆی بڕیبوو.

هەدیە پاش کەمێك سڵەمینەوە خۆی دا بەسەریدا و کەوتە داد و فیغان و گریان. بەڵام ئەوەی جووڵە بێ، لەو بەدی نەدەکرا. وەك بڵێی گیانی لەبەر نەمابوو، ئەوەی پەرچە کردار بێت نەیبوو، چاوی لەو خاڵە لانەدەدا کە بڕیبوویە سەری.

لە بەرانبەر ئەو هاوار و گریانە دڵهەژێنەی نەوەکەی، تاکە پەرچە کردارێکی کە هەستی پێ کرابێت، چاو داخستنی بوو. من بۆ ئەوەی

ئەو ژنە بەویقارە زیاتر ناڕەحەت نەکەم کە نەیدەویست هیچ شتێك ببینێ و ببیستێ، دەمویست ساتێك زووتر لەوێ دەربچم. چی بوو دڵی لە منیش ڕەنجابوو، یان هەر بەڕاستی نەیدەتوانی بێتەگۆ؟ یان بۆ ئەوە وای لە خۆی کردبوو تا نەبێتە بنێشتە خۆشەی سەر زمانی ئەو ژنانەی دەوروبەری کە بە دوای قسەیەکەوە بوون... من هەندێك مەمنوونیش بووم لەوەی قسەی نەدەکرد. چونکە نە دەمتوانی ڕەددی قسەکانی بدەمەوە، نە دەمتوانی لە بەرانبەریدا بەرگری لە خۆم بکەم، نە بەرگەی ئەسرینەکانیشیم دەگرت. هەر بۆیە، ئاوا بەجێم هێشتن.

بەڵام ئەوە چی بوو ئەو فرمێسکانەی لە چاوم نەدەبڕان؟ چی بوو ئەو فشارەی دڵمی دەپلیشاندەوە؟...

***

هەفتەیەك دواتر، لەسەر تەرمی ئەو داپیرەیەدا، هێشتا تەژی بووم لەو هەستانە. لەبەرخۆمەوە مرەمرم بوو: "نەنە! منیش وەك بەشێك لەم جڤاتە کە نەیتوانی هەدیەکەت بپارێزێت، تاوانبارم. تو خودا گەردنم ئازاد بکە!"





## ئایا کۆیلایەتی نەماوە؟

لەگەڵ یەکێك لە قوتابییەکانمدا کە لە تەلەفزیۆن کۆیلەکانی بینیبوو و زۆر کاریان تێکردبوو، خەریکی قسە و باس بووین. گەنجێکی بەهەست بوو و لەو شتەی کۆیلایەتیی پێدەوترێت، چەندی دەکرد سەری دەرنەدەچوو. باوەڕم وا بوو، ئەگەر کەسێك لەوانەی چنگ بکەوتایە کە کۆیلایەتی بە مرۆڤەوە دەکەن، دەستبەجێ قورسترین سزای دەدا. منیش هاوهەڵوێستی بووم. هەوڵم دا باسی ئەوەی بۆ بکەم کە بە هیچ جۆرێك ناکرێت ئەوە بەئاسایی سەیر بکرێت کەسێك کەسێکی دیکە بکات بە کۆیلە، ئەی خۆ ئاینەکەشمان ئەمەی یاساغ کردووە.

ئەوەشم بۆ ڕوون کردەوە کە ئەوەی ئەو هەر ڕابردوو تاوانبار دەکات و پێی وایە کۆیلایەتی لە ڕابردوودا بەجێ ماوە و گوناهێکی سەردەمانی کۆنە بۆچوونێکی هەڵەیە. واقی وڕما، وتی:

– چما لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا کۆیلایەتی ماوە؟

ئاوا وەڵامیم دایەوە:

– ئەی چۆن! ئینجا بە شێوەیەکی هێند بێڕەحم و بەربڵاوانە، کە لە هیچ سەردەمانێکدا وێنەی نەبووە...

واق وڕمانی بە تەواوی زیادی کرد. چاوە پڕ لە بەرائەتەکانی ئەبڵەق کردن و بڕینیە چاوانم، و لە مەبەستیی پرسیم.

باسی کۆیلە مۆدێرنەکانم بۆ کرد. ئەوەم بۆ باس کرد کە بەشێکی زۆری خەڵکی سەر ئەم زەوییە، لەم سەردەمەدا نسیبیان لە کۆیلایەتی هەبووە.

وتی:

– بەپێی ئەو قسانەی تۆ، دەکرێ هەر یەك لە ئێمە بە جۆرێك لە کۆیلە دابنرێت.

هەر بەڕاستی، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا، زۆر کەس لەژێر فەرمان و دیلیی دونیای ناخیدایە. ئەم دیلییە زۆر خراپترە. چونکە لە ناوەوە ئابلۆوقەی مرۆڤ دەدات، نەك لە دەرەوە. لەبەر ئەوەی گورگەکە لەناو سکی خوددایە، ڕووبەڕوو بوونەوەی فرە زەحمەتترە. کەسێك بووبێتە

بەندەی بەندە، بۆ بەدەست هێنانی ئازادی دەکەوێتە پەلەقاژە. ئەوەی لەژێر کاریگەریی و فشاری کەسانی تردا مافەکانی لە دەست دابێت، خەبات دەکات بۆ دووبارە گێڕانەوەیان. بەڵام ئەوانەی بوون بە کۆیلەی خراپییەکانی ناخیان، زۆر ئەستەمترە بتوانن ڕێی ڕزگار بوون بدۆزنەوە. نەفس، وەك ئەسپە دارینەکەی (تروونا)، لە ناوەوەڕا هەڵمەت دەبات. کاتێکیش شەیتان و مرۆڤە شەیتانییەکان لە دەرەوەڕا پاڵپشتیی دەکەن، مرۆڤ دەکەوێتە حاڵەتی ئەو کۆیلەیەی کەوتووەتە ناو لیتاوی نەنگی و گوناه و خراپەکارییەکانەوە.



ئایا دەتوانرێ ئەوانەی گیرۆدەی داوی مۆدیلات، عەرەق خواردنەوە، مادده هۆشبەرەکان، قومار، بەدڕەوشتیی، غەیبەت، ستەم کردن و ڕیشوەت وەرگرتنن، بە کەسانی ئازادی خاوەن ماف و ئیعتیبار ئەژمار بکرێن؟

ئینسان بۆ ئیمان هێنان ئافرێنراوە. ئاسوودەیی و خەیاڵ تەتیی ڕاستەقینەی، تەنها لە ئیمان هێنان بە خودادا چنگ دەکەوێت. ڕزگار بوونی ئینسان لە هەموو جۆرە دیلی و کۆیلایەتییەك و گەیشتنی بە ماف و ئازادییەکان، تەنها بەمە دێتە دی.

ئیی دیی دەبێت مرۆڤی ئەم ڕۆژگارە ئەم ڕاستییە ببینێت. ئەوەی نابێت بە بەندەی خودا بە ئازادی ناگات، بەڵکو دەکەوێتە ناو بێسەروبەری و بە شێوەیەکی ئەبەدیی سەربەخۆیی خۆی لەدەست دەدات. بەڵێ، ئەگەر ئەوانەی باسی پاراستنی مافی مرۆڤ دەکەن بەڕاستیان بێت، دەبێت بەر لە هەر شتێك بەوە دەست بە کار بکەن کە مرۆڤەکان بکەن بە بەندەی خودا، بەو جۆرە ڕزگاری دەکەن لە بەندایەتیی کردنی شتە بێ شومارەکان.



## نامەیەکی کراوە بۆ (کوچوک ئیمرا)

ڕۆڵەکەم ئیمرا!

ئەمڕۆ بە جەرگ بۆ سووتانەوە تۆم بیرکەوتەوە، چونکە یەکێك لە ڕۆژنامەکان ئەوەی نووسیبوو کە تۆ لەسەر ڕێیەکی ڕاست نیت. یەکێکی تریان، دەیپرسی: "کوچوک ئیمرا بۆ کوێ دەچێت؟"... چەند ڕۆژێکیش لەمەوبەر ئەوەم خوێندبووەوە کە لەناو کێشەدا نغرۆ بوویتە... ئەگەرچی ڕەنگە ئەمانە پێوەنان بن، وەلێ من لە ئاست ئەوەی کە ڕەنگە وا بن، دڵتەنگ بووم و ویستم لێت بە دەنگ بێم. چونکە ئەو دونیای مۆسیقای و فیلمەی هایت لەناویدا، چەندین ناوداری تواندووەتەوە و وای لێکردوون لە خۆیان وەڕس ببن... لەم گۆشەنیگایەوە، کەسێکی وەك تۆ کە تازە لە تەمەنی نەوجەوانیدایە،

لە ناوەندێکی وادا، بێگومان پێویستە زۆر وریا بیت. چونکە ئەگەر وای بۆ بچین کە تۆ بەو کەسانە نەتەنراویت کە ڕاوی شوهرەت و سەروەت دەکەن، زۆر زەحمەتە. ئەگەرچی ڕەنگە لە بارێکی واشدا نەبیت، کە زۆر گوێ لە ئامۆژگاریی بگریت، بەڵام من دیسانەوە دەمەوێ پێت بێژم کە سەروەت و شوهرەت و گشت خۆشییەکانی دیکەی دونیا، کاتیین و ڕادەبوورن، بۆیە شایانی ئەوە نین قوربانییان لە پێناودا بدرێت... هیوام وایە کەسانی گەورەی بەئەزموونی وات هەبن، ئەمانەت بیر بێننەوە. هەر هیچ نەبێت دایکە خۆشەویستەکەت، دەتوانێت وەك قیبلەنمایەك ڕاستییەکانت پێ پیشان بدات. دەخوازم، خزم و کەسە نزیکەکانتت لەبیر نەکردبێت. هەر وەك ئومێدەوارم ئەو باهۆزە گومڕاکەرەی ناوبانگ کە لەناویدایت، فرێی نەدابیتە نێو ئەو لیتاو و گێژاوەی ڕۆژنامەکان باسی دەکەن.

ئیمرا، من وەك مامۆستایەکی کۆنت، پێم وا نییە ئەمانەی لێتی داوا دەکەم زیادەڕەویی بێت. حەز دەکەم درێژە بەو خۆشەویستییەی نێوانمان بدەین. ئێ خۆ هۆگری و خۆشەویستیی جەماوەریش، هەر بە بەهێزی و هاوسەنگی و ڕێزگرتنی دابونەریت و ژیانێکی باوەڕدارانە دەتوانێت درێژە پێبدەیت. تەندروستیی ڕۆح و جەستە پەیوەستە بە خۆبەدوورگرتن لەوەی ببیت بە پیاوی فەزیحەتەکان. ئامان کوڕەکەم! تا پێت دەکرێ خۆت بەدوور بگرە و هەڵێ لە

دەست ئـەوەی ببیتـە بنێشـتە خۆشـەی سـەر زمـانی دەزگاکـانی ڕاگەیانـدن... چـونکە هـیچ بارودۆخێـك بـەردەوام نابێـت. گشـت ساتەکانی ژیان، ڕۆژێك دادێ دەبڕێنەوە. کە وا بـوو، ئەسـڵ وایـە لـە بەرانبەر فانییەکاندا، ئەبەدیی و باقییەکان هەڵبژێردرێن.

نـازانم، ئـەم قسـە و بۆچـوونانەم لـە کاتێکدا کـە تـۆ لـە لوتکـەی ناوبانگدایت، بە چ جۆرێك پێشوازییان لێدەکەیت؟ بەڵام من ئێسـتاش تۆ هەر بەو ئیمرا دڵسـاف و بێخەوشـە دەبینـم کـە لـە پـۆلی نۆیـەمی بنـەڕەتی لـە قوتابخانـەی (خەزنـە)دا، وانـەی ئـاینم پێدەوتـەوە، خوازیارم هەر واش بتبینمەوە.

ئێستا کە ئەم دێڕانە دەنووسم، ئەو ڕۆژەم بیر دێتـەوە کـە یەکـەم جار هاتیتە پۆلەوە. هاتیت و لەپشتی پشتەوە دانیشتیت. زۆر غەریب و شەرمن بوویت. ئەو کاتانە هێشتا فیلمێکت نەبوو بە نـاوی «منـداڵی نێـو ئازارەکـان»ەوە. کـە لـێم پرسـییت لـە کوێـوە هـاتووی، زۆر بەئەدەبـەوە وەڵامـت دایـەوە: "لـە دیاربـەکرەوە"... گەرچـی پـێش ئەوەی خۆت بیڵێیت، من شوێنەواری پەروەردەی ئەنادۆڵم تێدا بـەدی کردی، هەر بۆیە هەر لەو وەختەوە کەوتیتە بەر دڵم. بەڵام تۆ بـەهۆی چالاکییەکانی مۆسیقاوە، کە هەر لەو سەردەمانەوە دەستت پێکردن، نەتدەتوانی بەتەواوی دەوامی قوتابخانە بکەیت. هەر بۆیە، بۆم نـەلوا لە نزیکترەوە بتناسم. بـەڵام ئێسـتاش دڵخۆشـم بـەو گفتـەی هێشـتا

لەبیرت نەکردووە، کە گفتت دا بە دەنگە بەسۆز و هەست بزوێنەکەت، سوورەتی (یاسین)م لەسەر کاسێتێك بۆ تۆمار بکەیت... زۆر دڵخۆش بووم بەوەی ماوەیەك لەمەویەر بەو قوتابییانەی سەلامت پێدا ناردبوون، وتبووت کە هەر لەسەر گفتەکەی خۆتی. چونکە ئەو گفتە، لای من لە وەرگرتن و پێدانی کاسێتێك، گەلێك مانای زیاتری هەڵگرتووە... دەپرسی بۆ؟ لەبەر ئەوەی کە بیستم تۆ هێشتا لەسەر ئەو گفتەی، تێگەیشتم کە تۆ تا ئێستاش پەیوەستی بە بیروباوەڕەکەتەوە و هەر لا لە قورئان دەکەیتەوە و پابەندی دابونەریتەکانی. خوازیارم لەم بۆچوونەمدا بە هەڵەمدا نەبەیت.



ئیمرا! دەنگ خۆشیی یەکێکە لە گەورەترین بەخشایشەکانی خودای گەورە. پێویستە ئەو بەخششەش، بە گوێرەی ویستی

بەخشەرەکە بەکاربهێنرێت. لەم گۆشەنیگایەوە، داوات لێدەکەم بە سەمفۆنیایەك بچڕی کە لەسەرووی هەموویەوە بەندایەتی کردنی خودای گەورە و بەجۆش هێنانی ئەو مرۆڤە بەرز و تێکەیشتووانە بێت کە تۆیان زۆر خۆش گەرەکە. ئەنادۆڵی غەریب و غەمگینت لەبیر نەچێت... ئەو دوا مەنزڵی هەموومانە، دە با لە دەنگی تۆدا، باش باش دەنگ بداتەوە. با ئەوانەی گوێ لە دەنگی تۆ دەگرن، بەرەو ڕابواردنی ناشەرعی و سەرمەستی و بێ ئومێدی و هەستە ئاژەڵییەکان نەچن... بەڵکو بەپێچەوانەوە، هەوڵ بدە لە دڵیاندا هەستە باڵاکان و ئەوینە پیرۆزەکان بێدار بکەوە و بانگهێشتیان بکە بۆ ئەو ڕاستییانەی مرۆڤ دەکەن بە مرۆڤ... هەر کاتێك بە ئەنجامێکی وا گەیشتیت، دەکا شوکرانەی دەنگەکەتت کردووە.



کورتییەکەی، مۆچیاریی من بۆ تۆ ئەوەیە، ئەگەرچی ناوت (کوچوک ئیمرا)یە[1]، با ئاکار و مەعنەوییاتت گەورە بن. چاوت لەوە بێت ئیمان و ڕۆشنبیریت زیاد بکەیت. ئەگەر نا، ڕۆژێک دادێت هەر وەک ئەو کەسانەی سوارچاکی ئەو مەیدانە بوون، وەکو لیمۆیەکی ئاو گوشراو، فڕێ دەدرێیتە لاوە. ئەوەی دەمێنێتەوە، تەنها ڕابردوویەکی پەڵەدار و تەماوی و نووتەک و سیخناخ لە گوناه. هەرچی ئایندەشە، ئایندەیەکی پڕ لە پەستی و بێ ئومێدی ... نەکەی لە بیرت بچێت، ئەو کەشوهەوایەی تێیدایت، وەک خاکێکی لێژ وایە بەرەو هەموو خراپییەک غلۆرت دەکاتەوە. ئیمرا گیان! هەردەم خوو بدە ئەو کارانەی پەشیمانییان بەدواوە نییە.

***

لە کۆتایی نامەکەمدا، ڕێز و خۆشەویستیی خۆمت پێشکەش دەکەم و هیوادارم هەمیشە بە ئیمرا ڕێکوپێک و بێفیز و شەرمنەکەی پۆلی نۆیەمی بنەڕەتی بتبینمەوە...

وەهبی وەققاس ئۆغڵو

---

١- (ئیمرای بچووک –وەرگێڕ)

## پێڕست